

# کارەباو ڕاگرتنی دایەمۆ



* جۆرو پێهاتەکانی
* کارپێکردن
* چاککردنەوە



بتوێن سەعید محەمەد




حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی





بەڕێوەبەرێتیی

چاپ و بلاوکردنەوەی

سلێمانی

٢٠١٠

# کارەبا و زانستی داینەمۆ


- نووسەر: بیتوین سەعید محەمەد
- بابەت: زانستی
- پیتچنی: بەرزی بیتوین سەعید
- هەڵەچنی: کارزان عەبدوڵڵا
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم محەمەد ئەمین
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
- قەبارەی کتێب: ½ A٤
- ژمارەی لاپەڕە: ١٣٨
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٧٤٨)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی لەریا
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٣٦٢)ی ساڵی ٢٠١٠ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران / بەرامبەر ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ
ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

بـەنـــاوی
یەزدانی پاک و مەزن

پێشکەشە بە:

* ئەوکەسەی لەپێناو زانست و داهێنان ماندوو دەبێت و سەرقاڵی نهێنییەکانی ژیانە.

* بەرزی بیتۆڤن سەعید، هەڵگری مەشخەڵی زانست و پیشەی هونەریی.





## پێشەکی

**لەکۆنەوە زاناکان وتوویانە، زانین رووناکییە و نەزانین تاریکییە.**

**ئەم پەندو وتەیەش بە خۆڕایی نەوتراوە، بەتایبەت لە بواری کارەبادا، چونکە بەتەواویی مەبەستی وتەکەی پێکاوە، مرۆڤ سەردەم و ساڵانێکی زۆرە بەدوای شتێك و ئامێرێکدا دەگەڕێت کە بتوانێت تاریکیی شەوگاری پێ رووناك بکاتەوە و زۆر لایەن و کارەکانی ژیانی پێ رایی بکات، ئەوەبوو بە هەوڵ و بەدواداچوونی ئەکادیمی بەردەوام و گەڕان و پشکنینی رۆژانەی بەدوای نهێنییەکانی جیهانی کارەبادا، توانی خۆزگەکەی بهێنێتەدی، هەر لە دروستکردنی تەل و کۆیل و گڵۆپێك بۆ رووناککردنەوەی ژوورێك تا ئەمڕۆ، کە رووناککردنەوەی شارێك و زاڵبوونی بەسەر سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانی لێکەوتەوە، کە ئەگەر کارەبا نەدۆزرایەتەوە، ئاسن نەدەبوو بە موگناتیس، کە زۆربەی خزمەت و خۆشگوزەرانییەکانی ژیانمانی پێوە بەندە.**

**بەڕێزان: ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەم پەرتووکەی بەردەستمانە کە نووسەر (بیتوێن سەعید) توانیویەتی بەباشی بابەتە گرنگ و بەکەڵکەکەی بواری کارەبا پووختە و ئامادە بکات و بیخاتە بەردەست ئێمە، کە زۆر تێبینی و زانیاریی زانستییانەی بۆخوێنەر و زانستدۆستان رۆشن و ئاسان دەکات،**





هەروەها ناوەرۆکی بابەتەکان بەشێوەیەکی سادە و هونەریی تاوتوێ بکات و سەرکەوتووانە بۆ خزمەتی پرۆسەی فێربوون و تێگەیاندنی جۆرەکانی دروستکردنی کارەبا و چۆنییەتی جوولّە و کارکردنی جۆر و چاوگی بەرهەمهێنەرەکانیان، وەك ئامێری دینەمۆ، بە مرۆڤی کورد بناسێنێت و دواتر خزمەتێکی چاکی کتێبخانەی کوردیشی پێبکات کە لەم جۆرە بابەت و نووسینانە کەم و بێبەشە، کە ئەرکێکی گەورەی پرۆسەی نووسین و ئامادەکردنە.

بۆیە من لێرەدا دەستخۆشیی لە کاك بیتوێن دەکەم، دواپەیڤم بۆی سەرکەوتنە بۆ بەردەوامیی لەسەر رێچکەی نووسین و کۆکردنەوەی بابەتی زانستییانە، بەتایبەت پەرتووکە خنجیلانەکەی بەردەستمان، کە هەر نەبێت بە کوردی و بەکورتی سەرەتایەك لە زانست و تەکنۆلۆجیای کارەبای سەردەمی وروژاندووە و ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری چەشتووە، نموونەیان زۆر بێت، شایەنی سوپاس و دەستخۆشیکردنە!

ئەمەش لە دوو لاوە خزمەتێکی زۆر باشە بۆ:

١- چاوگێکی یارمەتیدەر و بەپێزی خوێنەری کوردە لە بواری زانستی بنەمای بەرهەمهێنانی کارەبادا.

٢- بەهێزکردن و فراوانکردنی نووسینی زانستی و بابەتی سەردەمییانە لە کتێبخانەی کوردیدا.

م. عوسمان مەحمود ئیبراهیم

رانیە - رەزبەری ٢٧٠٩ کوردی

**سەرنج و روونکردنەوە:**

دەمەوێت بە خوێنەرانی هۆگری زانست و ئارەزوومەندانی بواری تەکنیک و داهێنان بڵێم، ئامێری داینەمۆ (جەنەڕەیتەر – Generator) نووسین و باسێکی زۆری لەسەر کراوە بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزیی، بەڵام کتێبخانەی کوردی لەم نووسین و بابەتە زانستییانە کەم و بێبەشە، لەگەڵ ئەوەی بواری کارەبا زۆر پێویستەو گرنگە بۆ ژیانی رۆژانەمان، کەچی بەداخەوە نووسەر و رۆشنبیری کورد سست و کەمتەرخەمن بۆ بەکوردیکردنی ئەم بابەتە پێویست و بەکەڵکەی تەکنۆلۆجیای سەردەم و خزمەتگوزارییەی ژیان، کە رۆژانە بۆ راپەڕاندنی چەندەها لە ئیش و کارەکانمان پێویست و هاوکارەو بەردەوام ئەم داهێنانە لە پێشکەوتن و گەشەکردندایە.

ئێستا ئەوەی لەلای من جێگەی سەرنج و روونکردنەوەیە کێشەی نەزانینی زمانی بێگانەیە لەلایەن خوێنەری گەنجی کوردی زانستدۆست، بۆیە پێویستە ئێمەی خاوەن ئەزموون و شارەزاو زمانزان ئاورێکی خۆشەویستی و دڵسۆزییان لێبدەینەوە و ئەم ئەرکە پیرۆزو قورسەی بواری نووسین لە ئەستۆ بگرین و بەگوێرەی توانا رادەی زانیاریی و پسپۆریی خۆمان بەکارخەین، ئەگەر مشتێکیش بێت لە خەروارێك (هەر بوون لە نەبوون





باشتره)، ئەمەش بۆ گەڵاڵەکردنی ئەو داتا میکانیکی و کارەبایی و زانیارییە تایبەتمەندانەی نوێکاریی و گەشەسەندنی ئەم بوارە بەسوودەیە، بۆ بەرچاوخستن و بەرجەستەکردنی بەرهەمەکانی گۆڕانکارییە، تا خوێنەرانی کورد لێی تێبگەن.

زۆر راستە بۆچوونەکانی مرۆڤ تایبەت بە حەزو ئارەزووەکانی ئەگەر مەبەستی بێت لە گۆشەیەکی بچووك و رێکەوتێکی کەمیشدا بێت بە هەوڵ و تێکۆشان و ماندووبوون سەردەگرێت و دەگەنە ئەنجام، لە کۆتاییدا دەخوازم لە کەموکوورییەکان و هەڵەی هونەریی و چەوتیی زمانەوانیی ببوورن، هیوادارم ئەم جارەش توانیبێتم خزمەتێکی بچکۆلانەم بە زانستپەروەران و هۆبەی زانستیی کتێبخانەی کوردی کردبێت.

بیتوێن سەعید محەمەد

٢٠١٠





# بەشی یەکەم

**بابەتی یەکەم:**

**کارەبار جۆرەکانی (kinds Of Electricity)**

**١ - کارەبای جۆری جێگیر (Static Electricity)، بەهۆی لێکخشاندن.**

**٢ - کارەبای جۆری جوولاو (Dynamic Electricity)، بەهۆی داینەمۆ و باتری.**





بابەتی یەکەم:

کارەبار جۆرەکانی (kinds Of Electricity)

١ - کارەبای جۆری جێگیر (Static Electricity)، بەهۆی لێکخشاندن.

٢ - کارەبای جۆری جوولاو (Dynamic Electricity)، بەهۆی داینەمۆ و باتری.

ئەمیش دەکرێت بەدوو بەشەوە:

١- کارەبای تەزوو نەگۆڕ (راستەوخۆ) Direct Current -D.C

- بەهۆی داینەمۆی تەزوو نەگۆڕ و باتری (وێنەی داینەمۆی تەزوو نەگۆڕی ئۆتۆمبێل D.C).



٢- کارەبای تەزوو گۆڕاو (ناڕاستەوخۆ) Alternate Current A.C.

- بەهۆی داینەمۆی تەزوو گۆڕاو ( Alternate –Current Dynamo).

جۆر و پێکهاتەکانی داینەمۆ: (طور والتكوين المولدة الكهربائية) (Dynamo kindes And Composition ).

داینەمۆ: بەرهەمهێنەری تەزووی کارەبا ( Dynamo: Electricity Generator)

داینەمۆ بەشێوەیەکی گشتیی: ئامێرێکی لێکدراوە لە دوو بەشی سەرەکی کارەبایی و میکانیکی پێکهاتووە، جوولەی میکانیکی دەگۆڕێت بۆ وزەی کارەبا بە بنەمای بیەدۆزەی روودانی (کارۆ موگنەکار)، دواجار تەزووی کارەبا بەرهەمدێنێت بەگوێرەی پێکهاتەی نارك (Rotor Coil) تەزووی گۆڕاو (Alternating Current)، تەزووی نەگۆڕ ( Direct Current)، بە یەکەی (کیلۆ ڤۆڵت، کیلۆ وات، مێگاوات) پێوانەی بۆ دەکرێت.





## پێناسەی زانستی داینەمۆ

ئامێری داینەمۆ: دەزگایەکی بێ گیانە بە تەنیا تەزووی کارەبا دروست ناکات، تا لەگەڵ جووڵێنەرێکی هێزی میکانیکی یان هێزێکی سروشتی لێك نەدرێت و نەخرێتە گەڕ، ئەمەش بۆ سووڕانەوەی ناوك (Armature –یان ئەندامی جووڵاو (عضو الدوار – Rotor Coil)، کە بریتییە لە شەفت و چەندەها پلێتی پۆڵا، بە تەلی مس هەڵپێچراوە و ناوەخن کراوە لەناو ئەندامی جێگیر (Stator Coil) هەڵدەسوڕێت و بەهۆی بڕینی بواری موگناتیسییەوە دەبێتە هۆی

دروستبوونی وزەی کارەبا، بەپێی بیردۆزەی زانای بەناوبانگ (فارادای) ساڵی ١٨٣١ز کە توانی بە کردار پاڵهێزی کارەبای موگنەکار لە گەیەنەرێکدا پەیدا بکات (ئەندامی بەرهەمهێنەر – ئارمیچەر) بە بڕینی ژمارەی ئەو هێڵە هێزە موگناتیسییانەی کە لەنێوان هەردوو جەمسەری تەوەرەیەکی موگناتیسیدایە (ئەندامی جێگیر – ستیتەر).

ئەمە لە بنەمای سەرەتای دروستبوونی داینەمۆی سادەیە (مۆدیل کۆن)، کە دوو جۆرە، داینەمۆی سادەی (تەزووی گۆڕاو - AC)، بەهۆی دوو ئەڵقەی جیاوازی لەیەك دوور (تەزووی کارەبای گۆڕاوەمان) دەست دەکەوێت و داینەمۆی سادەی (تەزوو نەگۆڕ - DC)، بەهۆی یەك ئەڵقەی بەرامبەر یەك (تەزووی نەگۆڕمان) دەست دەکەوێت بێ جیاوازیی لە ئامرازەکانی تری ناوەوەی (ناوك)، بەڵام لە داینەمۆ گەورە و نوێکاندا (جەنەرەیتەر) ئامرازی خۆتەزووپێدەری جووڵاو (Exciter) بەکاردەهێنرێت، کەواتە ئێستا بۆ دروستبوونی وزەی کارەبا و بەگەڕخستنی داینەمۆکان، پێویستمان بە (جووڵێنەر- Engine) هەیە بۆ جووڵانی ناوکی داینەمۆکان (رۆتەر کۆیل).





زۆربەی داینەمۆ گەورەکان یان جەنەرەیتەر بەشی جوولێنەریان تۆربینە (Turbine)، کە لە دواییدا جۆر و کارو پێکهاتەکانیان باس دەکەین، ئەم جۆرانە لە وێستگەکانی سەر بەنداوەکان و تاڤگەکان بەکاردەهێنرێن، کە شوێنەکانیان جێگیرە، وەك وێستگەکانی (کارۆئاویی – Hydro Power) سامەڕا، دوکان، دەربەندیخان، دێرەلوکی دوارۆژ لەسەر زێی گەورە، لە دوایـیشدا بە تەزوویەکی کەم و ڤۆڵتییەیەکی بەرزی ٣٣، ١٣٢، ٤٠٠ کەی ڤی بەهۆی تەلی ئەستوور و تاوەری Tawer گەورە دەگوازرێنەوە بۆ شارەکان، لەوێش بەهۆی وێستگەی گۆڕین و دابەشکردن دەنێردرێت بۆ گەڕەکەکان، دووبارە لە رێگەی ترانسفۆرمەرەوە ٢٠، ٥٠، ٦٣، ١٠٠، ١٥٠، ٢٥٠، ٥٠٠، ٦٣٠، ١٠٠٠ کەی، ڤی، ئەی، دەڕوات بۆ ماڵ و کارگەو شوێنەکانی تر.

وێنەی (وێستگەی کارۆئاویی دەربەندیخان)





دوای ئەوە داینەمۆی جوولێنەری گازە (محركات الدزل – Diesel Engine) بە قەبارەی جۆراو جۆری گونجاو و جوولاو (Mobile) دروست دەکرێن و دەتوانرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بجوولێنرێن، کە بەچەند یەکەیەکی کارەبایی هێزو توانا پێوانە دەکرێن، دانان و کارکردنیان زۆربەی لەناو کارگە و پرۆژەو شوێنی گشتیی و گەڕەکەکانی شارە، هەروەها چەند دانەیەك لە وێستگەکان یەکەی کارەبای لێ دروست دەکرێت، لەم کاتەدا پێی دەوترێت جەنەڕەیتەر (Generator Set).





روونکردنەوەی زۆرتر لە وێنەکەدا:



هەروەها داینەمۆ بچووکەکان کە جووڵێنەرەکانیان بە سووتێنەری بەنزین کار دەکەن، تایبەت بۆ ماڵان و کاری کارەبایی سادە و وەرشەکان دروست دەکرێن. سەیری ئەم وێنەیەی خوارەوە بکە:








**بەرهەمهێنانی کارەبا بەشێوەیەکی گشتیی**

**سەرچاوەکانی بەگەڕخستنی داینەمۆ**

داینەمۆی کارەبا بەهۆی جوولەی میکانیکی ( Mechanical Motion)، بەچەند شێوەیەك كە لە سەرچاوەی سروشتی و پیشەسازیی (سووتەمەنی) بەرهەم دێت کاردەکات، جوولەکەش دواتر دەگۆڕێت بۆ وزەو هێزی کارەبا (Electricity Power) سەرچاوەکانیش، وەك: (ئاو، گەرمی، شەپۆلی دەریا، با، هەڵم، هێزی دەست، بەنزین، گاز، خەڵوزی بەردیین، غازی سروشتی)، ئەم سەرچاوانەش بۆ دروستکردنی جوولەی میکانیکی و هەڵسووڕانی داینەمۆیە، کە دواتر دەبێتە وزەی کارەبا، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێ کردووە بە خولانەوەی (رۆتەر) لەناو (ستێتەر)، ئەمە وەك ئامێری داینەمۆ کە هۆیەکی گەورەو بە یەکەم سەرچاوەی گرنگ دەژمێردرێت بۆ بەرهەمهێنانی تەزووی کارەبایی زۆر، کە بە سەدان مێگاوات مەزەندە دەکرێت.

بەڵام لە پێشترو ئێستاش زاناکان هەوڵدەدەن بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا بەڕێگەیەکی کەمخەرجی و پاك و بێدەنگ، تا نەبێتە فاکتەر بۆ پیسبوونی ژینگە (تلوث البیئة)و هەراسانی ژیانی مرۆڤ، ئەمانەش وەك ڕێگەی





کارلێکردنی کیمیایی (Battery)و هێزە نارکییەکان ( Neutron Power Station)، کە بۆ بەگەڕخستنی تۆربینە بەهۆی هەڵم، وەك توخمی یۆرانیۆم (U)، سیسیۆم (CS)، لە ئەنجامی بەلەتکردنی گەردیلەی توخمەکان گەرمییەکی زۆر پەیدا دەبێت و ئاوی پێ دەکوڵێت و دوایی بۆ هەڵم، هەڵمەکەش پەروانەی تۆربینەکە دەخولێنێتەوەو کارەبا بەرهەم دێت، بەڵام ئەمجۆرە مەترسییەکی گەورەی لەسەرە، بەتایبەتی لەکاتی تەقینەوەی، بۆ ژیانی مرۆڤ و زیندەوەر و رووەك، هەروەها وزەی تیشکی خۆر کە فۆتۆنەکانی رووناکی دەگۆڕدرێن بۆ ئەلیکترۆن بەهۆی توخمی سلیکۆن (SL) و جەرمانیۆم (GE) و کادمیۆمی (CD) بلوری بۆ دروستکردنی خانەی خۆر (خلیة الشمسیة) کە پێی دەوترێت وێستگەی کارۆ رووناکی، ئەمجۆرە هیچ پاشەڕۆکێکی زیانبەخشی نییە بەرامبەر ژینگەو مرۆڤ، وا چاوەڕوان دەکرێت ئەم وێستگەیە لە دوارۆژدا لە بەرزاییەکی زۆر کە (٣٦٠٠٠ کم) لەسەر زەوییەوە دوورە، دابنرێت، لەبەرئەوەی لەو شوێنە تیشکی خۆر هەشت جار لەو وێستگەیە زیاترە کە لەسەر زەوییە.





## وێستگەی کارۆ رووناکی بۆ دروستکردنی وزەی کارەبا



هەروەها بە ڕێگایەکی تر بەکارهێنانی هێزی هەڵم ( Steam Power Station) هەیە بۆبەگەڕخستنی تۆربینی هەڵمیی، بەڵام ئەم ڕێگەیە پێویستی بە سەرچاوەی دابینکردنی هەڵمە بە ئامرازی (Boiler)، کە بە سووتەمەنی کاردەکەن، کە هۆکاری پیسبوونی ژینگەیە، بۆیە ئەم وێستگانە بەزۆری لەو وڵاتانە دادەنرێن کە سەرچاوەی نەوتیان زۆرە، بە نموونە لە عیراق، وەك وێستگەکانی: بێجی، دۆرە، موسەیەب، دواتر هەولێر، چەمچەماڵ، وێستگەی ٥١ مێگاواتی گازئۆیلی تاسلۆجە (داینەمۆی جوولێنەری گاز)، کە بەنەوتی ڕەش (Heavy Fuel Oil) کاردەکات.

هەروەها لەلایەن داهێنەرانەوە هەوڵدراوە سوود لە سەرچاوەی تریش وەربگیرێت بۆ پەیداکردنی کارەبا، وەك: شەپۆلی دەریا، گەرمای ژێرزەوی، زبڵ و خاشاك و پاشماوەی سووتەمەنی رووەکی و ئاژەڵ، ئاوی پیسی کۆکراوەی ئاوەڕۆ گەورەکان (زێراب- Sewerage)، کە سروشتی کوردستانیش بێبەش نییە لەم سەرچاوانە، وا نیازە حکومەتی هەرێم لە داڕۆژدا لەگەڵ کۆمپانیاکان دەرەوە لەو زبڵ و خاشاکەی کوردستان لە پارێزگاکان وزەی کارەبا بەرهەم بهێنێت. بۆ نموونە لە ١ ٪ی گەرمیی ناخی زەوی لە رێگەی گەرمکردنی ئاو دەتوانێت ٢٦ هەزار ساڵ کارەبا بەرهەم بهێنێت، ئەو پلەی گەرمییەش لە قولایی ١ – ٥کم لە ناخی زەویدا دەبێت، هەنووکە ئەم هەوڵە لە وڵاتی ئوسترالیا (پرۆژەی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا) لە بەرنامەدایە، کە لە ساڵی ٢٠٢٠-دا دەتوانرێت بڕی ٢٢٠٠ مێگاوات کارەبا بەرهەم بهێنرێت.

بەڵام ئێستا دروستکردنی کارەبا لە زۆربەی وڵاتانی جیهان بەهۆی رێگەی بەکارهێنانی ئاوە (Hydro Power Station) ئاشی ئاو- لەسەر بەنداو و تاڤگەکان کە باشترین و بێ زیانترین رێگە دەژمێردرێن بۆ وبەرهێنانی کارەبا دوور لە پیسبوونی ژینگە.





## وێستگەی کارۆئاویی بۆ دروستکردنی وزەی کارەبا



دیسان بەکارهێنانی هێزی با بۆ دروستکردنی تەزووی کارەبا بەهۆی ئاشی با (طاحونة- Wind Power Turbine) لە هەندێ وڵاتانی تر پەیڕەو دەکرێت وەك: ئەڵمانیا، ئیسپانیا، دانیمارك، بەریتانیا، کە بە باشترین سەرچاوەی بێ خەرجیی و پاکی سروشت دادەنرێت لە جیهان.

## وێستگەی وزەی با (تۆرپین) بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا



سەرچاوە سەرەکییەکانی جوولەی داینەمۆ سێ جۆرن:

یەکەم: هێزی میکانیکی- بەهۆی سووتەمەنی ( Mechanical Engine).

لە جوولەی میکانیکیدا بزوێنەری بەنزین و گازو غازی سروشتی و ناوك و خەڵوزی بەردین و هەڵم، وزەو هێزی کیمیایی و گەرمی سووتەمەنی (Energy Of Chemical) دەگۆڕێت بۆ هێزو جوولەی میکانیکی (Energy Of Motion).

دووەم: هێزی سروشتی (ئاو، با، خۆر، گەرمی زبڵ و خاشاك، شەپۆلی دەریا و غازی سروشتی)، بەم شێوەیەی خوارەوە کارەبا بەرهەمدێت:

١- ئاو: بەهۆی هێزو جوولەی بەردەوامی شلە (تیۆری جوولەی خۆیی – Kinetic Energy)، کە ڕژتەری داینەمۆکە هەڵدەسووڕێنێت، ئەم ڕێگەیەی دروستکردنی کارەبا پێی دەوترێت ( Hydro Power Station).

٢- با: بەهۆی هێزو تەوژمی جوولەی بەردەوامی هەوا ڕژتەری داینەمۆکە هەڵدەسووڕێت پێی دەوترێت (ئاشی با – طاحونات) Winde Power Turbine.

٣- خۆر: بەهۆی گۆڕینی فۆتۆنەکانی تیشکی خۆر بۆ ئەلیکترۆن لە ڕێگەی تووخمی کانزایی ناو باتری وزەی کارەبا بەرهەمدێت.

٤- گەرمی زبڵ و خاشاك: بەهۆی سووتانی زبڵ و خاشاکەکەو دروستبوونی گەرمی دواتر بۆ هێزو تەزووی کارەبا.

٥- شەپۆلی دەریا: بەهۆی بۆرییەکی گەورە کە لە دووری ١٠٠م لە کەنار دەریاوە دادەنرێت و بەهێز ئاو دەچێتە ناوی و پاڵ بە هەوای ناو بۆرییەکە دەنێت و جوولێنەرێك دەخولێنێتەوە لە شێوەی تۆربینی ئاویی، یەکەم





ویستگەی کارەبا بە شەپۆلی دەریا لە ئوستالیا لە ساڵی۲۰۰۹ ز دادەمەزرێت.



٦- غازی سروشتی: بە هۆی سووتانی غازی سروشتییەوە لە جوولێنەری تایبەت هێزی میکانیکی بەرهەمدێت، دواتر هەڵسووڕانی ئارمێچەر و رۆتەری داینەمۆکە، سەرئەنجام هێز و تەزووی کارەبا دروست دەبێت.

ویستگەی کارەبای غازیی (٥٠٠ مێگاوات).







## سێیەم: هێزی دەستیی (Handle Power)

تێبینی:

هێزی دەست: کە هێزێکی سروشتی بەردەوامی مرۆڤە زۆرجار بەئاسانی وزەی کارەبا بەرهەمدێت بەهۆی هەڵسووڕانی ڕۆتەری داینەمۆ، ئەم سەرچاوەی جووڵەی دەستییە زۆر بەکەمی بەکاردێت، کارکردنی بەم شێوەیە:

خودی دەست جووڵێنەری داینەمۆکەیە، واتە هێزی مرۆڤ بەکاردێت بۆ دروسکردنی تەزووی کارەبا، وەك لە لایتی دەستیی و ئامێری تەلەفۆنی مۆبایلی سەربازیی بە هەڵسووڕانی ڕۆتەری داینەمۆکە لە ڕێگەی دەسکی دروستکرا و کە ئێستا بەکارهێنانی کەمبووەتەوەو تەنها لە هەندێ داینەمۆی تایبەت نەبێت، وەك: شەحنکردنی پاتری ئامێری تەلەفۆنی مۆبایل.

**زانـیــــاریی:**

بۆئەوەی لێمان تێك نەچێت:

دوو جۆر جووڵێنەر (المحرك- Engine) هەیە، جۆری یەکەم- جووڵێنەری سوزتەمەنی (میکانیکی)، لەم جووڵێنەرەدا جووڵەو هێزی کیمیایی و گەرمی سووتەمەنی دەگۆڕێت بۆ جووڵەو هێزی میکانیکی هەڵسووڕان، وەك جووڵێنەرەکانی ئۆتۆمبێل، جووڵێنەرەکانی داینەمۆی کارەبا، جووڵێنەرەکانی ئامێرە گەورەکان.





بەڵام جۆری دووەم - جووڵێنەری کارەبا (محرك الكهربائية — Electricity Motor)، یان بزوێنەری کارەبایی ئەم جۆرە تەزوو و وزەی کارەبایە دەگۆڕێت بۆ جووڵە و هێزی میکانیکی.



<u>تێبینی و ڕوونکردنەوەی زۆرتر:</u>

بزوێنەری کارەبایی (Motor) بەپێچەوانەی جووڵێنەری داینەمۆ (بەرهەمهێنەری کارەبا — المولیدة الكهربائية) دروستکراوەو کاردەکات کە لەڕووی هونەری نارەخن و پێکهاتەکانیان جیاوازییان تێدایە، لە بزوێنەری کارەباییدا هێزو وزەی کارەبا دەگۆڕێت بۆ هێزو جووڵەی میکانیکی، بەڵام لە جووڵێنەری میکانیکی وەك لە پێشەوە وتمان سەرچاوەی جووڵەیە بۆ داینەمۆکە، سەرچاوەی جووڵەکەش هێزی میکانیکییە - وەك جووڵێنەری سووتەمەنی (بەنزین، گاز، غازی سروشتی، خەڵوزی بەردین).





سەرچاوەی هێزی میکانیکی (سووتەمەنی) داینەمۆ

ئەم سەرچاوەی جووڵە سەرەکییانە (هێزی میکانیکی) پۆلێندەکرێن بەم شێوەیە:

هەموو داینەمۆیەك سەرچاوەی جووڵەی خۆی هەیە بۆ کارپێکردنی کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین، بەڵام باسەکەمان بەگشتیی جوولێنەری گازە، لەبەرئەوەی داینەمۆکانی یان (جەنەرەیتەر)ەکانی بەردەستمان جۆری جوولێنەری گازن.

١- جوولێنەری گاز (محرك ديزل – Diesel Engine)

ئەمجۆرە بە شلەی سووتەمەنی گاز (گازۆیل –Gas Oil) کار دەکات، لە دواییدا بەدرێژیی لێی دەدوێین.

وێنەی جوولێنەری گاز



هەروەها جوولێنەری بەنزین (محرك بنزين Petrol Engine)، کە بەشلەی سووتەمەنی بەنزین کار دەکات، ئەمجۆرە لە داینەمۆی بچووکدا (مالآن) زۆر بەکاردەهێنرێت لەڕووی پێکهاتەی هونەریی و شێوەی ئامێرەکانی ناوەکی و دەرەکی جیاوازییان هەیە لەگەڵ جوولێنەری گاز.

ئەمانەش جیاوازیی نێوان جوولێنەری گاز و بەنزینە:

| جوولێنەری گاز | جوولێنەری بەنزین |
| --- | --- |
| ١- سووتەمەنی زۆر دەوێت. | ١- سووتەمەنی کەم دەوێت. |
| ٢- خێرایی زۆرە. | ٢- خێرایی کەمە. |
| ٣- هێزی کێشی مامناوەندییە. | ٣- هێزی کێشی زۆرە. |
| ٤- پلاکی سووتانی هەیە لەگەڵ کۆیلی شەحن و دیلکۆ. | ٤- پلاکی سووربوونەوەی هەیە (Heter) لەگەڵ دەرزی گاز (Nozzle). |
| ٥- ئامرازی کاربریۆتۆری هەیە. | ٥- ئامرازی پەمپی سەرەکی گازی هەیە. |

### ٣- جوولێنەری تۆربین (Turbine)

تۆربین بریتییە لە ئامێرێکی میکانیکی، چەند جۆر لە قەبارەو هێز و دیزاینی هەیە بە غاز (هەڵم) و ئاو و هەوا کاردەکات، بەگوێرەی بوونیان لەو شوێنە لە کارگەکان بە غاز (هەڵم) لەسەر بەنداو و تاڤگەکان بە ئاو کاردەکەن، لە پێدەشت و بەرزاییەکان و دەربەندەکان بە هەوای سروشتی کاردەکەن کە پێیان دەوترێت ئاشی با.

بەگشتیی تۆربین بەخێراییەکی زۆر دەخولێتەوە، بۆ سارکردنەوەی ئامێرە میکانیییەکانی ناوەوەی رۆن بەکاردێت و بۆ سارکردنەوەی رۆنەکەش ئاو بەکاردێت، تۆربین ئامرازی کەم و زۆری خێرای هەیە (Gear Box)وە بەرداشێکی گەورە (Fly Wheel) لەنێوان تۆربینەکەو داینەمۆکەدا هەیە بۆ داکردن و بە هێزکردن و گواستنەوە و بەردەوامی جووڵە بۆ داینەمۆکە.

تۆرپاین سێ جۆری هەیە:

١- تـۆرپـاینـی هـەڵـمـی کـارۆگـەرمـی.

٢- تـۆرپـایـنـی ئـاویی (مـائـی) کارۆئاویی.

٣- تـۆرپـایـنـی ئـاشـی بـا (هـوائـی).





### ١- جۆری هەڵمی Steam Power Turbine.

ئەم جۆرە تۆرپینە بەهۆی هێز و پریشەری هەڵی ئاو (غاز) لەژێر پاڵە پەستۆیەکی زۆردا ٣٥کغ - سم٢ بە گەرمی ٤٠٠ پلەی سەدی پەروانەی تۆرپینەکە هەڵدەسوڕێت، ئەم هەڵمەش بەهۆی ئامێری ئیکۆنۆ مایزر (Economizer) لەگەڵ بۆیلەر بەرهەم دێت، کە لە ڕێگەی لوولەی چوون (In Let Pipe) هەڵمەکە دەچێتە ناو کێسینگی تۆرپینەکە، بەمەش پەروانەی تۆرپینەکە دەخولێتەوە کە شەفتی داینەمۆکەی لەسەر بەستراوە، پاشان هەڵمەکە لە ڕێگەی لوولەی دەرچوون ( Out Let Pipe) دەچێتە دەرەوە، بەم جۆرە داینەمۆکە هەڵدەسووڕێت و کارەبا دروست دەکات.

### ٢ - جۆری ئاویی (مائی) Hydro Power Turbine.

ئەم جۆرە بەکارهێنانی زۆرە، داینەمۆ گەورەکان بەم جۆرە تۆرپینە بەگەڕ دەخرێن، بۆ دەسکەوتنی تەزووی کارەبا بۆ شارەکان، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە ئاویان زۆرە. داینەمۆی وێستگەی کارۆئاویی کە بەم تۆرپینانە کاردەکەن وزەو هێزێکی کارەبایی زۆر بەدەست دێنن، کە بە ٥، ١٠ ،٥٠ ،٥٠٠ ،١٠٠٠ مێگاوات مەزەندە دەکرێت لەگەڵ دوو لایەنی باش، کە کەمتێچوونی پارەو پیس نەکردنی ژینگەیە.

کاری ئەم تۆرپینە بەهۆی هێز و جووڵەی خۆی شلە بەتیۆری کین ماتیکی (Energy Kinematics) بەرهەم دێت، کە لە شوێنێکی بەرزەوە ئاو





دەکەوێتە سەر پەروانەی تۆرببینەکە، کە شەفتی داینەمۆکەی لەسەر بەستراوە و دەخولێتەوە.



وێستگەی کارۆئاویی (Hydro Power Station)

لە ڕێگەی ئامێری کۆنتڕۆڵ و میکانیکی، خێرایی و کارکردنی بەڕێوەدەچێت و بەهۆی یەکەی بەرهەمهێنانی کارەبا تواناو تەزووەکەی ڕێکدەخرێت، ئەم جۆرە بەبڵاوترین جۆری بەرهەمهێنانی کارەبا دەژمێردرێت لە جیهاندا و پەسەند کراوە، لەبەرئەوەی پاشماوەی ژەهر و دووکەڵیان نییە و زیان بە مرۆڤ و ژینگە ناگەیەنن، وەك. هەردوو

وێستگەی کارۆئاویی دوکان و دەربەندیخان و دەربەندی رایات، کە بە سەرچاوەی سەرەکی کارەبای هەرێمی کوردستان دادەنرێن، لەگەڵ هەردوو پرۆژەی هایدرۆپاوەری تاڤگەی بێخاڵ بەهێزی ١,٢ مێگاوات و دێرەلوک بە هێزی ٣٠ مێگاوات لە جۆری بەنداو و ئاوی رۆشتوو ( Dam and Water Way )، کە بە جۆری تۆرپینی ئاسۆیی و شاقوولیی وزە بەرهەم دێنن کە لە جێبەجێکردندان، هەروەها وێستگەکانی حەدیسە، موسڵ، بێخمە و بادۆش کە تەواو نەکراون لە عێراقدا، وەك جیهانیش: وێستگەکانی پارانە لە بەرازیل و گۆرکی لە وڵاتی چین و پرۆژەی کارەبای گەورەی تورکیا (گاپ) لەسەر رووباری دیجلە لە باکووری کوردستان، کە زیانێکی گەورە بە سامانی ئاوی نیشتمانیی دەگەیەنێت لە دوارۆژدا. هەڵبەتە ناوچەکانی ئێمەش بیتوێن و پشدەر لەو بەهرە سروشتییانە بێبەش نین بۆ بەخشینی خزمەتگوزارییەکان بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی، کە ئەگەر حکومەتی هەرێم ئاوڕێکی باش و زانستییانەی لێ بداتەوە، بۆ ئایندە و دوا رۆژ دەتوانرێت بە هەوڵ و هیمەتی هەموو لایەك تەکنیك و دڵسۆزان وێستگەی کارۆئاویی (Hydro Power)، لەسەر ئەم چەم و رووبارانەی خوارەوە دروستبکرێت بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا:

١ - رووباری دۆڵی بۆتێ و شاورێ.

٢ - رووباری دۆڵی سونێ و زەڵێ.

٣- رووباری دۆڵی هیزۆب و سماقوڵی.

٤- رووباری دۆڵی شەهیدان و تووە سووران.





٥- رووباری دۆڵی مەرگە.

٦- رووباری دۆڵی سێ دەرە.

٧- رووباری زێی بچووك- گەناو.

بۆ زانین، ئەوشوێنانە هیچ کێشەیەکی لەناوچوونی زەوی کشتوکاڵییان نابێت، کاتی دروستکردنی بەنداو و بەربەست، لە کوردستانیش بەگشتیی چەندەها شوێنی تر هەن بۆ دروستکردنی بەنداو و دانانی تۆرپینی ئاویی بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا، وەك: رووباری کۆیە و باوە شاسوار لە کفری، زەڵم لە هەڵەبجە، تابین لە سورداش... هتد.

٣- جۆری وزەی با

(تۆرپینی وزەی هەوایی- Wind Power Turbine)

ئەم جۆرە داینەمۆیە لە کەنار دەریاکان و شوێنی بەرز و دەربەندەکان کە هەوای جووڵاو (با)یان زۆرە، دادەنرێت و تەزووی کارەبا بەرهەم دێنێت، کە بەهۆی پانکەیەکی گەورە جوولەکە (بەشی میکانیك) دەست دەکەوێت بۆ ئیشپێکردنی داینەمۆکە، قەبارەی گەورە و بچووکیان هەیە، یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی دروستبوونی کارەبا، وزەی بایە، کارکردنی داینەمۆکە بەهۆی جووڵەی پانکەکەیە کە ناڕاستەوخۆ بەهۆی لێدانی هەواوە دەخولێتەوە، تەکنۆلۆژیایەکی ساکارو سادەیە، کە بێ خەرجیی، بێ کێشەی هونەریی زۆرو سیانەی کەمە، پێکهاتووە لە تاوەرێکی بەرز (- بنکەی راگر- Tower)و پەروانەیەکی ئاسۆیی (باڵی خولاوە - Rotor Blade)و کەللەی خولاوە (Rotor Hub) لەگەڵ ژووری





(Nacelle) ئامێرە میکانیکی و کارەباییەکان، کە ئەمانە لەخۆ دەگرێت: ئامرازی وەستان (brake) شەفتی خێرایی نزم (Low – Speed Shaft)و بۆکسی خێراییەکان (Gear Box) کە رۆڵی خێرایی و زۆرکردنی سوورِانی هەیە بۆ سەر شەفتی خێرایی ( High – Speed Shaft)، هەروەها داینەمۆکەش (Generator) لە کێبڵەکانی بەشی خوارەوەش گۆڕەری تەزووی کارەبا (Transformer) دانراوە.

ئەم جۆرە تۆرِبینە نزیکەی ٣٠ساڵە خزمەت بە رەوشی زانست و کارەبا دەکات، کە وزەی بەرهەمهاتووی ٤٠٣٠٠ مێگاواتە بۆ ٢٠ ملیۆن خێزان لە ئەورووپا لەگەڵ گەورەترین دەرئەنجامی باش ئەویش کەمکردنەوەی ٠٠٠ ١٠ ملیۆن تەن غازی دووانە ئۆکسیدی کاربۆنە، بەپێی ئەو برِە کارەبایەی کە بەرهەمی دێنێت لەچاو جوولێنەری داینەمۆی سووتەمەنیی و وزەی ئەتۆم بێ زیانگەیاندن بە ژینگە، کە رۆژ بەرِۆژ لە پێشکەوتن و گۆرِاندایە لە قەبارە و توانا و بواری تەکنیکی، هەروەها بەهۆی باشیی لە بەکارهێنان و رەواجی بەردەوام لە چاکسازیی کەم، کە ٦ مانگ جارێکە.

ئێستا داینەمۆی تۆرِبینی با لە ٥٠ وڵاتی خاوەن کەنار دەریاو کیشوەری ئەورووپا بەکارهێنانی هەیە، یەکەم وڵات ئەڵمانیایە دواتر ئیسپانیا، دانیمارك کە گرنگییەکی باش بەم یەکانەی بەرهەمهێنانی کارەبا دەدەن و رێژەیەکی زۆر کارەبا دابین دەکات، بە زمانی عەرەبی پێ دەوترێت (تاحونات). کەنار و کۆرِنیشی دەریاکانی وڵاتی بەریتانیا لەم جۆرە تۆرِبینانەی زۆر تێدایە، کە ٥٠٪ی سەرچاوەی دابینکردنی کارەبان، لە زۆربەی وڵاتانی کیشوەری ئەورووپا لەسەر خانووەکانیان (ماڵەکان) هاوڵاتییان ئەم جۆرە داینەمۆیە بەکاردێنن.





## داینەمۆی تۆڕبینی هەوایی



وەك لە پێشتر وتمان، سەرچاوەكانی هەڵسووڕانی داینەمۆ دوو جۆرن، ڕێگەی پیشەسازیی (سووتەمەنی)و ڕێگەی سروشتی، بەڵام ئێمە لێرەدا جۆری جووڵێنەری گاز دەكەینە بابەتی سەرەكی نووسینەكەمان، چونكە زۆربەی داینەمۆكانی (Dynamo) وڵاتمان جۆری جووڵێنەرەكانیان گازە (Diesel Engines)، كە بە سووتەمەنی گاز كاردەكەن و بەكارهێنانیان زۆرە بۆ دابینكردنی وزەی كارەبا لە كارگە و شوێنە گشتییەكان و بیر و پرۆژەكانی ئاو و گەڕەكەكانی شار، كە هەرچەندە زانستی نوێ لە پێشكەوتندابێت ئەم ئامێرەش (داینەمۆ) بەردەوام لە گۆڕاندایە، بەڵام ئەوەی ئێمە بیزانین و مەبەستمانە، باسی دەكەین و دەیخەینە بەرچاو و دەستی خوێنەران، بەداوای لێبووردنەوە لە هەرچی كەم و ناتەواوییەك لەگەڵ ڕێزم...

بابەتی دووەم:

## (داینەمۆی جۆری جوولێنەری گاز)
## Diesel Engine Generator (Dynamo)

**بزوێنەری گاز (محرك الديزل) Diesel Engine**

ئەم جۆرە زۆر بەربڵاوە لە دروسکردنی جوولێنەری داینەمۆکان، بەتایبەت لە بەگەڕخستنی داینەمۆی گەورەدا جگە لە داینەمۆی وێستگەکانی کارۆئاوییی، بەڵام لەو وڵاتانەی کە سەرچاوەی ئاویان کەمە، وێستگەکانی جوولێنەری گاز بەکارهێنانی زۆرە کە دەتوانرێت وێستگەی بەرهەمهێنانی ٥٠-٥٠٠ مێگاواتی لێ دروست بکرێت بۆ شار و وڵات، بەکارهێنانی لە کارگە و پرۆژە و گەڕەك و شـــــــارۆچکەکان بەتوانای ٥٠ کیـلۆ وات - ٥ مێگاوات بۆ ئیشپێکردنی ماتۆڕ و ترومپای ئاو و ئامێرە کارەباییەکان و ڕووناککردنەوە.





بە دووجۆر لە سیستمی ڤۆلتییە، سێ هێڵ (Three Phase)و یەك هێڵ (Single Phase) کارەبا بەرهەم دەهێنرێت، لەبەر ئەوەشە ئەم جووڵێنەری گازی داینەمۆیانە بەکاردەهێنرێت لەو شوێنانەی کە هێز و ماوەی کارکردن و بڕی کارەبایان زۆر دەوێت لەچاو ئەو داینەمۆیانەی کە جووڵێنەریان بچووکن و بە سووتەمەنی بەنزین کاردەکەن، کە ناتوانن بەردەوام بن لە کارکردن و بێهێزن لە بەرهەمهێنانی کارەبا.



**هۆکارەکانی زۆرتر بەکارهێنانی جووڵێنەری گاز لە داینەمۆدا**

یەکەم: داینەمۆی جووڵێنەری گاز (کارگەو پرۆژەکان) بەرگریی زۆرتری هەیە بۆ مانەوەی لە کارکردن و (پلەی گەرمی بەرز، جووڵە و هێزی سوانی میکانیکی)و دابینکردنی بڕی کارەبای بەهێز، بۆیە ئەم

جوولێنەرەی داینەمۆی گازە زۆرتر بەکاردەهێنرێت بۆ دروستکردنی داینەمۆی جۆری سووتەمەنی.

دووەم: لە رووی هونەرییەوە جوولێنەری داینەمۆی گاز، سووتەمەنی کەم دەوێت، خێراییەکەی بەتین و قورس (عەزم)و هێزی کێشی زۆرە، بۆیە دەتوانرێت (جەنەرەیتەری- Generator) وزەبەرزی پێ هەڵسووڕێت ٦٠- ١٠٠- ٥٠٠ کەی، ڤی، ئەی- ١٢٥٠- ٢ مێگا-... هتد.

بەڵام لەبەرئەوەی جۆری جوولێنەری داینەمۆی بەنزین، هێزی هەڵسووڕانی کەم و تێچوونی پارەی سووتەمەنی زۆرتر و کێشی کەمە، تەنها بۆ ناو ماڵان و هەندێ شوێنی تایبەت بەکاردەهێنرێت (وەرشە) بە ئەمپێری کەم. بەپێچەوانەشەوە ئەو شوێنانەش ئەوجۆرە داینەمۆ بچووکانە دەخوازێت کە تەزوو و هێزیان کەمە.







جوولێنەری گاز (Diesel Engine)

ئەم جۆرە جوولێنەرە کە بە دیزڵ ناودەبرێت (داینەمۆی جوولێنەری گازی)، بۆ یەکەم جار لەلایەن زانا و ئەندازیاری ئەڵمانیایی رودلف دیزڵ (Diesel) (١٨٥٨ – ١٩١٣) لە ساڵی ١٨٩٢ز داهێنرا، کە بە ناوی خۆیەوە لە جیهاندا بڵاوبووەوە. ئەم جوولێنەرە لە دیزاینی سەرەکیدا وەك جوولێنەری بەنزین وایە، بەڵام لە رووی میکانیزمی چەند ئامرازێکی دەرەکیدا جیاوازیی هونەریی و میکانیکی و کارەبایی هەیە و هێڵی سووتانی لەگەڵ جوولێنەری بەنزین جیاوازە و بە شلەی سووتەمەنی گاز (Gas Oil) کار دەکات. بەگوێرەی داواکراوی هێز و کێش جوولێنەرەکە قەبارە و شێوە و ژمارەی لوولەکەکانی (Cylinder) دەگۆڕێت و دیاریی دەکرێت، چ لە شێوەی پیتی I ئینگلیزی ٤و٦ پستۆن یان لەسەر پیتی

X,V ٨ و ١٢ و ١٦ پستۆن. به تویّری سووتانی ناوەکیی کار دەکات (محرك ذات الاحتراق الداخلي - Internal Firing Engine). که ئەمەش دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەم: جوولێنەری دیزلی دوو دەگە (محرك دیزل ثنائي الاشواط- Tow Stroke Cycle Diesel Engine).

دووەم: جوولێنەری دیزلی چوار دەگە (محرك دیزل رباعي الاشواط- Fore Stroke Cycle Diesel Engine).




جوولێنەری جەنەڕەیتەری گاز (Diesel Engine Generator)

بەڕێزان، ئەوەی لێرەدا زۆر مەبەست و پێویستە لێدوانی لەسەر بدەین، جوولێنەری جۆری گازە (جەنەڕەیتەری گەورە)، که ناونیشانی نووسینی ئەم نامیلکەیەیە بە هەردوو بەشی میکانیکی و کارەبایی، که بەپێی

بۆچوونی کۆمپانیا و ناوی زانایان ناویان لێناوە، بۆ نموونە جوولێنەری گاز، جۆری جۆندێر فەرەنسی، جۆری ڤالڤۆی سویدی، داینەمۆ جۆری ئەکسای تورکی، هەروەها پێرکنس ئینگلیزی، قەبارەکەشیان بەگوێرەی لەخۆگرتنی رۆن دیاریی کراوە، وەك: ٦ لیتریی، ٨ لیتریی، ١٠ لیتریی، ١٢ لیتریی، ١٦ لیتریی، ٥٠ لیتریی ١٠٠ لیتریی و... هتد، توانای داینەمۆکەش ٢٠ کەی ڤی ئەی، ٤٠ کەی ڤی ئەی، ٦٠ کەی ڤی ئەی، ١٠٠ کەی ڤی ئەی، ٥٠٠ کەی ڤی ئەی، ١٠٠٠ کەی ڤی ئەی، ٢٠٠٠ کەی ڤی ئەی... هتد.

لەڕووی ناوهێنان و دەستەواژەی سەر زمانی خەڵك بەگشتیی، بچووکەکانیان پێیان دەوترێت موەلیدە یان داینەمۆ، بەلاّم گەورەکانیان پێیان دەوترێت جەنەرەیتەر سێت (Generator Set).

روونکردنەوە: داینەمۆ (Dynamo) لەڕووی ناوهێنانی هونەرییەوە وشەیەکی ئینگلیزییە و موەلیدە وشەیەکی عەرەبییە بە کوردی (بەرهەمهێنەری کارەبا).

چۆنییەتی میکانیزمی جوولێنەری گاز:

دڵی جوولێنەری گاز، ترومپای گازی سەرەکییە ( Fuel Main Pump، کە جووڵە لە کرەنك شەفت (Shaft Crank) وەردەگرێت بەهۆی کەم شەفتی خۆی و لە رێگەی کۆپلینگ (Coupling). هەندێك لە جوولێنەرەکانی گاز (Diesel) پێش ژووری سووتانی هەر لوولەکێك پلاکی هیتەری کارەبای هەیە، کە تەنها لە سەرەتای کردنەوەی





سویچی سەرەکی کار دەکەن بۆ گەرمبوون و سووتانی گازەکە لەگەڵ هاتنی پرژانی گاز لە پرژێنەرەکانەوە (Nozzle)، کە لە رێگەی دوو پالێونەری گاز (Filter)و چەند بۆرییەکی گازەوە گازەکە لە تانکی سەرەکییەوە وەردەگرن بەهۆی ترومپای سەرەکییەوە (Fuel Pump). پێش پرژێنەرەکان لوولەی گەڕانەوەی گازی زیاد هەیە (انبوب فائز) بۆ ناو پالێونەرەکان دووبارە چوونەوەی بۆ پرژێنەرەکان و ژووری سووتانی سەر لوولەکەکان. کرداری سووتان روودەدات بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و گوشاری زۆر لە رێگەی هاتنی پاڵەپەستۆی پستۆنەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە. هەروەها بەهۆی تینی پرژانی گازی دەمی پرژێنەکان گازەکە دەسووتێت، بەمەش کرداری هێزی گەرمی و کیمیایی دەگۆڕێت بۆ هێز و جووڵەی میکانیکی، واتە هەڵسووڕانی کرەنگ شەفت و بەگەڕکەوتنی جووڵێنەر، ئێستا جووڵێنەری مۆدیل بەرزی گاز زۆر گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، وەك ئامرازی پاراستن و زاڵبوونی (Control)، کاتی کێشەی هونەریی تێدایە، هەروەها کۆنترۆڵی جووڵە و توندوشلیی قایش پانکەو مێشکی ئۆتۆماتیکی و کاتی زۆربوون و کەمبوونەوەی جووڵەی بزوێنەرەکە لە ئەنجامی دروستبوونی زۆر و کەمیی بارکردن (Load) روودەدات لەسەر جەنەڕەیتەر (Generator)و ئامرازی کەمکردنەوەی لەرزینی هەیە (Vibration Damper) بۆ راگرتن و هاوسەنگکردنی جووڵەو لەرزین.





## جیاوازی میکانیزمی جوولێنەری گاز و بەنزین

**تێبینی:**

**لە جوولێنەری جۆری قەبارە ١٦ لیتر رۆن بەرەو سەر.**

| جوولێنەری گاز | جوولێنەری بەنزین |
|---|---|
| ١- ترومپای سەرەکی سووتەمەنی (گاز) هەیە. Lnjection Pump Main | ١- کابرێتەری هەیە. |
| ٢- شووتەو ساردکەرەوەی هەوای دەرەکی هەیە. Charge Air Cooler | ٢- شووتەی هەوای هەیە. |
| ٣- هیتەری سووربوونەوەی هەیە. | ٣- پلاکی کارەبای هەیە. |
| ٤- پرژێنەری گازی هەیە. Nozzle | ٤- نییەتی. |
| ٥- ساردکەرەوەی رۆنی هەیە. Oil Cooler | ٥- نییەتی |
| ٦- دوو پالێونەری رۆنی سەرەکی و لاوەکی هەیە. Lubricating Oil Filter Full Flow Part Flow | ٦- نییەتی |
| ٧- ئامرازی دابینکردنی هەوای سروشتی و بەردەوامی هەیە. Turbo Charger | ٧- شووتەی هەوای هەیە. |
| ٨- دوو پالێونەری گازی هەیە. Double Fuel Filter | ٨- دوو پالێونەری بەنزینی هەیە. |
| ٩- قفڵ و کۆیلی وەستانی گازی ترومپای سەرەکی هەیە. Stop Solenoid | ٩- نییەتی |
| ١٠- کۆنترۆڵی خێرایی جوولێنەری هەیە (بەپێی لۆد). Engine Speed Control | ١٠ هەیەتی. |
| ١١- شل و توونکەری ئۆتۆماتیکی قایشپانکەی هەیە. Automatic V. Belt Tensioner | ١١- نییەتی. |





**پێکهاتە سەرەکییەکانی دەرەوەی جووڵێنەری گاز**

١- ترومپای سەرەکی سووتەمەنی (Main Fuel Injection Pump).

٢- ئامرازی دابینکردنی هەوای سروشتی بەردەوام (Turbo Charger).

٣- پالێونەری گاز Double Fuel Filter.

٤- پرژێنەری گاز (Nozzle -فوهة الحقن).

٥- هیتەری سووربوونەوە (شمعة التوهج- Glow Plug).

٦- شووتە و ساردکەرەوەی هەوای دەرەکی- Charge Air Filter Cooler.

٧- ساردکەرەوەی رۆن Oil Cooler.

٨- قفڵ و کۆیلی وەستانی گازی ترومپای سەرەکی Stop Solenoid.

٩- کۆنترۆڵی خێرایی جووڵێنەر Engine Speed Control.

١٠- شل و توونکەری ئۆتۆماتیکی قایشپانکە Automatic V-Belt Tensioner.

١١- دوو پالێونەری رۆنی سەرەکی و لاوەکی Lubricating Oil Filter Full And Part Flow.

١٢- جۆزەی پاڵەپەستۆی هەوا.

١٣- جۆزە و ریلەی ئاگادارییەکان.

١٤- پالێونەری ئاو Water Filter.





## جووڵێنەری گاز **Diesel Ingine**

**لێدوان لە پێکهاتە سەرەکییەکانی دەرەوەی جووڵێنەری گاز**

Diesel Ingine Main Compositon

**١- ترومپای سەرەکی سووتەمەنی: مضخة حقن الوقود الرئيسي (Main Fuel Pump)**

پارچەیەکی سەرەکی جووڵێنەری گازە لە چەند لوولەیەکی بچووك و نۆزڵدار بەگوێرەی ژمارەی لوولەکە سەرەکییەکانی جووڵێنەرەکە پێکهاتووە، جووڵەی میکانیکی لە کرەنك شەفت Crank Shaft وەردەگرێت لە رێگەی کۆپلینگ، Coupling کەم شەفتی تایبەتی خۆی هەیە بۆ هەڵسووڕانی لوولەکەکان بە دوو ئامرازی کارەبایی و میکانیکی تەحەکومی پی دەکرێت و کاردەکات، وەك: ئامرازی رێکخەری هێز و جووڵە (Governor گەڤەرنەر)، کە ئەمیش دوو بەشە، یەکەمیان: پێی دەوترێت کۆیلی وەستان Stop Soleniod، دووەمیان: کۆنترۆڵی خێرایی جووڵێنەر Engine Speed Control.

یەکەمیان، بۆ کارپێکردن و وەستانی ترومپای سەرەکی سووتەمەنییە، کە لە رێگەی کۆنترۆڵی کارەبایی کاری خۆی دەکات، بەهۆی زمانەی رێگەپێدانی کارەبایی Control Valve کە لەناو کەللەی ترومپاکەدایە، رێگە بە سووتەمەنی گاز دەدات بۆ هاتنی لە تەنکییەوە





بۆ ناو ترومپاکە (لە ڕێگەی کردنەوەو داخستنی سویچی سەرەکی On-Off).

دووەمیان، کۆنتڕۆڵی خێرایی جووڵێنەرە، کاتی زۆرکردنی بار لەسەر جەنەڕەیتەر بەهۆی ریلەیەکی گەرمی کە لەسەر دەکشن دانراوە. بەهۆی مێشکی کارەباییەوە فەرمان دەکات بە ترومپای سەرەکی بەهەڵسان بۆ ڕاکێشانی بڕی زۆرتر لە سووتەمەنی گاز بۆ بەتینکردنی خێرای جووڵێنەر، تا لە یەکدا هێز بداتە جەنەڕەیتەر و جووڵێنەرەکەش نەکوژێتەوە بۆ ناردنی تەزووی کارەبای زۆرتر.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە نیشانە (Mark) هەیە لەسەر هەردوو لای ترومپاکە و لاشەی جووڵێنەر بۆ تایمدان و دانانەوەی پەمپەکە کاتی تێکچوونی بەشێوەیەکی گونجاو.

(ترومپای سەرەکی گاز)



**پارچە سەرەکییەکانی ترومپای سەرەکی سووتەمەنی**

١- بلۆکی لوولەکەکان Cylinders Block.

٢- بلۆکەکان Cylinder.

٣- کۆپلینگ Coupling.

٤- کەمشەفت Cam Shaft.

٥- سپرینگ Spring.

٦- بورغوی ڕێخەری ناردنی گاز Regulation Nut.

٧- کونی تێچوونی گاز In Let Pipe.

٨- کونی دەرچەی گاز Out Let Pipe.

٩- ڕێکخەری پاڵنەر Booster Regulator.

**٢- ئامرازی دابینکردنی هەوای سروشتی بەردەوام**

**(دارمة الهواء - Turbo Charger)**

بۆ دەستکەوتنی هێز و تینی سووتانی باش لەناو ژووری سووتاندا بەشێوەیەکی تێر و تەسەل و بۆ بەرهەمهێنانی خێرایی و هێزی میکانیکی دیاریکراو، کە زۆر گرنگ و کاریگەرە بۆ کارکردنی جووڵێنەری سەردەم، ئەویش ئامرازی هەوای دابینکەری بەردەوامە.

(تۆربۆ چارجەر) کە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە ناردن و هەڵمژینی هەوای دەرەکی (ئۆکسجین)، ئەمەش لە ڕێگەی جووڵەی سەر و خوارووی





پستۆنەکانی ناو لوولەکەکان (Cylinders) دەبێت بۆ بەروودان بە سووتان و تێرکردن بە هەوای زۆرتر، کە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە، هەر لایەك پەروانەی تایبەتی خۆی هەیە، یەکێکیان هەوای پاك و سروشت رادەکێشێت بۆ ناو ژووری سووتان دووەمیان هەوای پیس و سووتێنراو (غاز - دووکەڵ) فرێدەداتە دەرەوە، کارکردنیان بە شێوەی خۆبزوێن و (ئۆتۆماتیك) بۆ بەروودانی خێرایی و زۆرتری کاری سووتان لەناو ژووری سووتانی جووڵێنەر.



**٣- پالێونەری گاز Fuel Filter - المرشح الوقود**

لە جوولێنەری گەورەی دیزڵدا چەند پالێونەرێکی سووتەمەنی هەیە بۆ پاککردنەوەی گاز لە پیسی، وەك ئاو و شتی نامۆ پێش چوونی بۆ ناو ترومپای سەرەکی (Pump Injection)، هەروەها دوای ترومپاکەش پالێونەر هەیە. ئەم پالێونەرانە دەبێت زۆر بەتووندیی و ڕێکوپێك لە بنکەی خۆیدا ببەسترێت لەگەڵ ئۆرینگ (O -ring)، کە بە هیچ شێوەیەك نابێت هەوای دەوروبەر وەربگرن تا هەوا نەچێتە ناو بۆرییەکانی گاز و بەتایبەت پالێونەری یەکەم دوای تانکی سەرەکی گاز.

**تێبینی:**

شلبەستنی پالێونەری گاز، کونبوونی بۆری گاز، هەروەها پیسبوونیان دەبنە هۆی دروستبوونی کێشەی هونەریی و کاریگەریی خراپ لەسەر ڕەوشی ئیشکردنی جوولێنەر و داینەمۆ، هەروەها هەواکردنی.

**٤- پرژێنەری گاز (Nozzle - فوهة حقن - الرشاش)**

پرژێنەری گاز، بریتییە لە ئامرازێکی هەستیار و گرنگ لە کارپێکردنی جوولێنەری گازو لە چەند بەشێکی ورد پێکهاتووە لەسەر هەر یەکێك لەسەری لوولەکەکان (سلندەر) دەبەسترێت، کاری پرژێنەری گازە بۆ ناو ژووری سووتان لەژێر پاڵەپەستۆیەکی زۆر بەهێزدا بۆ بەهەڵمکردنی یان وردکردنی گەردیلەکانی تووخمی شلەی گاز لە ڕێگەی کونە دەرزی سەری نووکی بەشی خوارەوەی.





لەم پارچانە پێکهاتووە:

١- دەرزی هەستیار. ٢- سەرپۆش (کۆڤەر). ٣- بوورغو رێکخەری پرژێنەری گاز. ٤- سپرنگ. ٥- دەرزی پاڵنەر. ٦- درزی دەرچەی گاز. ٧- شوێنی هاتنی گاز لە ترومپای سەرەکی. ٨- شوێنی گەڕانەوەی گاز، گازی زیادە بۆ ترومپای سەرەکی، بە چەند شێوەیەك دەرزی و سەری نووکی بەشی خوارەوەی دروست دەکرێت، وەك:

١- پرژێنەری یەك کون. ٢- پرژێنەری کوندار. ٣- پرژێنەری خنکێنەر. ٤- پرژێنەری سەری راستەوخۆ.

تێبینی: لەسەر پرژێنەرەکان بۆری گەڕانەوەی زیادەی گاز هەیە بۆ ناو پەمپی سەرەکی.

٥- هیتەری سووربوونەوەی کارەبایی (شمعة التوهج - Glow Plug)

لە هەندێ جووڵێنەری گازدا هیتەری سووربوونەوە هەیە لە سەرەتای کارپێکردنی جووڵێنەر کار دەکات لەگەڵ کردنەوەی سویچی سەرەکی، ئەمەش بۆ یارمەتیدانی زۆرتری گڕدانی سووتەمەنی گاز بۆ ئیشکردنی خێرا.

٦- شووتە و ساردکەرەوەی هەوای دەرەکی (C.A.C –Charge Air Cooler)

لە بۆرییەکی قەبەی درێژی کوندار پێکهاتووە، بۆ وەرگرتنی هەوای دەرەکی





دروستکراوە، لە سەرەتا و دەمی ئامرازی هەوای سروشتی بەردەوام (تۆڕبۆ چارجەر) بەستراوە.

٧- ساردکەرەوەی رۆن (Oil Cooler)
لە بۆرییەکی شێوە پان و درێژ پێکهاتووە، لەناویدا چەند بۆرییەکی تری ئالۆز و باریك هەیە بۆ ساردکەرەوەی رۆن بەکاردێت، ئەمەش دوای بەکارهێنان و چەورکردنی ئامرازەکانی ناوەوەی جوولێنەر، کە پێویستی بە دابەزینی پلەی گەرمی بەرزی رۆنەکە هەیەو دووبارە گەڕانەوەی بۆ ناو جوولێنەر.

٨- قفڵ و کۆیلی وەستانی ترومپای گازی سەرەکی (Stop Solenoid)
ئامێرێکی کارەباییە لەسەر ئامێری ترومپای سووتەمەنی سەرەکی دادەنرێت، بریتییە لە کۆیلێکی کارەبایی بە تەزووی D.C ١٢ ڤۆڵ و ٢٤ ڤۆڵ کار دەکات بە هاوکاریی ماشەیەك لەسەر قۆڵی دەرگای ترومپای سەرەکی.
کارکردنی: لەگەڵ کردنەوەی سویچی سەرەکی On، جەنەڕەیتەر بەهۆی ئیشکردنی کۆیلی کارەبای ماشەکەی دەرگای گازی پەمپی سەرەکی دەکاتەوە، بەوە رێگا بە هاتنی گاز دەدرێت بۆ ناو پەمپی سەرەکی دواییش بۆ سەر پرژێنەرەکان (Nozzle) + ژووری سووتان، کاتی کوژانەوەی جوولێنەر سویچ Off دووبارە لە رێگەی نەمانی تەزووی کارەبا لەسەر





کۆیلەکە (Solenoid)، ماشەکەی دەرگای ترومپای سەرەکی سووتەمەنی دادەخات و ڕشتنی گاز بۆ سەر پرژێنەرەکان دەوەستێت + دواییش جوولێنەرەکە دەکوژێتەوە.

۹- کۆنترۆڵی خێرایی جوولێنەر (Control Engine Speed).
ئامرازێکی کارەباییە لەسەر ئامێری ترومپای گازی سەرەکی دادەنرێت، فەرمان (ئیعاز) بە جوولێنەر دەدات بۆ خێرایی و هێواشبوونەوەی کاتی زۆر و کەمی بارکردن (لۆد)، کە بەهۆی کارپێکردنی بزوێنەرە کارەباییەکان (Motors) ڕوودەدات.

۱۰- شل و تونکەری ئۆتۆماتیکی قایشپانکە (Tension V-Belt)
ئامرازێکی میکانیکی خۆبزوێنە (Automatic)، چاودێریی توندو شلیی قایشپانکەی جوولێنەر دەکات کاتی زۆر و کەمی خێرایی بەهۆی کەم و زۆریی بارکردن لە جەنەرەیتەر، تا لە پچڕان و دەنگەدەنگ بیپارێزێت هەروەها ڕوونەدانی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جوولێنەر کە پانکە و ترومپای ساردکەرەوەی ئاوی لەسەر بەستراوە.

۱۱- دوو پالێوەنەری ڕۆنی سەرەکی و لاوەکی (Oil Lubricating Filter Full and Part Flow)
جوولێنەری گەورەی گاز ئەلتەرنەیتۆرەکان (Alternator) دوو تاسێ پالێوەنەری ڕۆنیان هەیە (المرشح الزیت)، پالێوەنەری سەرەکی و لاوەکی بۆ





پالاوتنی تووخمی نامۆ و پاراستنی لە پیسبوون، هەروەها بۆ باشتر راگرتنی و لینجی و کێشی رۆنەکە (Viscosity)، هەروەها بۆ مانەوەی شایستەی زۆری چەورکردن (Lubrication) ئامێرە جوولاوەکانی ناو جوولێنەر.

تێبینی: دووجۆزەی رۆن هەیە بۆ زانینی هێز و پاڵپەستۆی رۆن، یەکێکیان، لەسەر پاڵێونەری رۆن (فیلتەر) دانراوە. دووەم، لەسەر بلۆکی لوولەکەکان.

١٢- جۆزەی ئاماژەدەری پاڵەپەستۆی ناو پاڵێونەری هەوا ( Pressure Drop Indicator For Air Filter)

جۆزەیەکە بۆ ئاماژەپێکردنی گوشار و پاڵەپەستۆی هەوای دەرەکی دانراوە، تابزانین پاڵێونەری هەوا (شووتە) پیسە یان پاکە و ئاگاداری کاتی پاککردنەوەی بین، کەوتووەتە دوای پاڵێونەری هەوا یان پێش ئامێری دابینکەری هەوای سروشتی بەردەوام (تۆڕ بۆ چارجەر).

١٣- جۆزە و ریلەی ئاگادارییە پێویستییەکان

چەند جۆزە و ریلەی ئاگادارییە پێویستییەکان هەن لەناو پارچەکانی دەرەوەی جوولێنەر دادەنرێن بۆ کاتی کارپێکردن و کۆنترۆڵپێکردنی کێشە هونەرییەکانی جەنەرەیتەر، وەك جۆزەی کەم و زۆر و سارد و گەرمی ئاوی ناو رادێتەر، جۆزەی پاڵە پەستۆی رۆن جۆزەی کەم و زۆریی سوزتەمەنی،





جۆرەی پیسی و گەرمیی رۆن، جۆرەی پاڵەپەستۆی سەرەکی هەوا و چەندی تر.

١٤- پاڵێونەری ئاو Water Filter لە هەندێك جوولێنەری گاز، وەك (ڤاڵڤۆ، لیپهێر، مان، داهێ) كە شایستەی گۆڕینە لەبەر هۆی پیسبوونی بە كلس.



(داینەمۆی جوولێنەری گاز- A – V – K ٦٠)



بەشی دووەم:

## کارکردن و پێکهاتەی زانستی جەنەڕەیتەر
## تەزوو گۆڕاو - Generator AC (مولدة التيار المتغيرة)





## بەشی دووەم:

## کارکردن و پێکهاتەی زانستی جەنەڕەیتەر
## تەزوو گۆڕاو - Generator AC (مولدة التيار المتغيرة)

((بەشی کارەبا))

وەك لە پێشەوە وتمان ئەو مولیدانەی کە بچووکن و جوولێنەرەکانیان بەهۆی سووتەمەنی بەنزین کاردەکات بە زاراوەی داینەمۆ Dynamo ناو دەبرێن و ئەو مولیدانەی کە هێز و تەزووییان زۆرە و قەبارەیان گەورەیە و جوولێنەرەکانیان بە سووتەمەنی گاز کار دەکات، بە زاراوەی جەنەڕەیتەر Generator یان Generator Set ناودەنرێت.

بەگوێرەی شوێن و وڵات جۆری جوولێنەرەکانیان لە رووی بەکارخستنەوە دیاریی دەکرێن، وەك ئەو وڵاتانەی نەوتیان هەیە جوولێنەرەکان بەسووتەمەنی گاز کار دەکەن، واتە جوولێنەری گاز Diesel Engine ئەو وڵاتانەی کە تاڤگە و بەنداوی ئاویان هەیە جوولێنەری داینەمۆکان بە تۆڕبینی ئاوە، واتا وێستگەی کارۆئاویی دادەمەزرێنن Hydro Power Station، ئەو وڵاتانەی کە هەوای زۆرە جوولێنەری ئاشی با بەکاردەهێنن Wind Power Turbine.





بەشی کارەبای مولیدە وەك بەشی میکانیك (جوولێنەر) ئاڵۆزو گرنگە، بۆیە پێویستی بە ئاگالێبوون و چاککردنەوەی بەردەوام و باش هەیە (Maintenance) بۆ پاراستنی لە شکان و تێکچوونە هونەرییەکانی، ئەمەش شارەزابوون لە کارپێکردن و بەکارهێنانی پێویستە بۆ زۆرتربوونی تەمەنی.

میکانیزمی دینەمۆ یان جەنەریتەر سێت (مۆدێل نوێ)، کە ئەلقەو فەحمەی نییە، ئامرازی تەزووپێدەری تێدایە (Exciter). لە ڕێگەی بڕینی هێڵەکانی موگناتیس واتە بەکارپێکردن (موگنەکار) کار دەکات لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت.



**بابەتی یەکەم:**

**پێکهاتە سەرەکییەکانی جەنەڕەیتەر Main Composition Generating Sets**

١- ئەندامی جێگیری سەرەکی (عضو الثابت الرئيسي – Main Stator Coil) لەگەڵ ئەندامی خولاوەی سەرەکی (عضو الدوار الرئيسي – Main Rotor Coil)، کە دوو بەش و ئەندامی سەرەکی و گرنگی پێکهاتەی جەنەڕەیتەرن.

ئەندامی جێگیر (ستێتەر) کە رووی دەرەوە و بەشی سەرەکی داینەمۆکە پێکدەهێنێت، لەم بەشانە پێکهاتووە:

ا- لەش: ئاسنێکی موگناتیسی رەقە لە شێوەی لوولەك یان شێوازی جیاجیا دروستکراوە، ئەمەش لە چەند پەڕەیەکی ئاسنی تەنك کە ئەستوورییان لە نیو ملیم تێناپەڕێت، کۆکراونەتەوەو ئاسنی موگناتیسییان دروستکردووەو چەند ڕێڕەوێك لە ناویدا هەیە بۆ دانانی پێچراوەکان (Coil) (بۆیە لە پارچەی تەنك دروستکراوە بۆ کەمکردنەوەی وێڵە تەزوو کە دەبێتە هۆی گەرمبوونی ئاسنی موگناتیسەکە لە ئەنجامی بەرهەمهێنانی تەزووی کارەبا).

ب - پێچراوەکان (Coil)

وتمان لەناو ئاسنی موگناتیسیدا چەند ڕێڕەوێك هەیە کە لە ١٨ -٢٤ - ٣٦ -٤٨ -٧٢ ڕێڕەو پێکدێت، لە ناویاندا سێ پێچراوی تەلی مس دانراوە، کە هەر یەکێك لە پێچراوەکان جەمسەری سەرەتا و کۆتایی خۆیان هەیە لە دەوری چەندەها پلێتی پۆڵادا بە گۆشەی ١٢٠ پلە





جێگیرکراون، هەرسێ پێچراوەکان (کۆیل) لە سەرەتاکانیان پێکەوە سێ سەری سەرەکی گەرم دروست دەکەن R.S.T، بۆئەوەی سێ شەپۆلی تەزووی سێ ڕەوگەی گۆڕاو دروست بکەن لە داینەمۆی (~٣)، کە پێوانەی نێوان هەر یەکێکیان ٣٨٠- ٤٠٠ ڤۆڵ (سری فێس)، کۆتایی پێچراوەکانیش لە ناوەوە لەگەڵ یەکدا سەری سارد Earth پێکدێنن، ئەمەش بەهۆی دروستبوونی سەرجەم کۆکراوەی پەستانی ڤۆڵتیەیە بە پێوانەی سفر (Mp)، کە لەگەڵ سەرە گەرمەکان لەناو مۆلیدەکەوە بۆ ناو بۆکس پەنەڵەکە دێتەدەرەوە بە پێوانەی ٢٢٠ ڤۆڵ، لەگەڵ هەر یەك لە فێسەکانی R.S.T (سەنگل فێس)، بەڵام لە داینەمۆی یەك ڕەوگەیدا (Phase Single)، تەنها یەك کۆیل دادەنرێت، واتا یەك ڕەوگە دروست دەبێت.

ئەندامی جێگیری سەرەکی (Main Stator Coil)



ج – هەردوو جێگرەهەڵگر و قەباغی لاتەنیشت کە ئیشیان هەڵگری بەشی خولاوە Rotar Coil و ئەستوونە (Shaft) بەشێوەیەکی هاوسەنگ و تەریب بە بەشی وەستاو بەهۆی جێگرکان Ball Bearing.

٢- ئەندامی خولاوەی سەرەکی (ئارمێچەر) (عضو الدوار الرئیسي- Main Rotor Coil).

ئەم پارچە پێکهاتووە لە کۆیلێکی گەورەی هەڵپێچراوی مس Armature لەسەر چەندەها پلێتی پۆڵای نێوان داری درێژکۆ کراوەتەوە، ئەندامێکی گرنگە، دڵی داینەمۆیە، کۆیلەکان جەمسەری موگناتیسییان هەڵگرتووە بەپێی جۆرو شێوەی دروستکردن و کارکردنیان لە ١٢، ٨، ٦، ٤، ٢ جەمسەری تەلی مسی ئەستوور پێکدێن، لەسەر شەفتێکی دوو سەر بۆڵبەرین دانراوە کە سەرەتا و کۆتایی (N.P) هەڵپێچراوەکە (ئارمێچەر) پەیوەست کراوە بە تەبەڵەی دایۆدەکان، دواتر بە هەڵپێچراوەی خولاوەی ئامرازی ئێکزایتەر (Coil Exciter Rotor) بۆ وەرگرتنی تەزووی کارەبای گۆڕاو (A.C) ئێکزایتەر، دواتر بە تەزووی نەگۆڕ (D.C) بەهۆی دایۆدەکان.



(ئەندامی خولاوەی سەرەکی)

به کورتی لەم بەشانە پێکدێت:

١- ئەستوون -Shaft: لە ئاسنێکی ڕەقی درێژ دروستکراوە هەڵگری ئەندامی خولاوە (ئارمێچەر) و تەبەڵەی دایۆدەکانە بەهۆی بۆڵبەرینەکان (Bearinges) لەگەڵ ئامرازی تەزووپێدەر (ئێکزایتەر)، ئەویش لە دوو پارچە پێکدێت.

ڕوونکردنەوەی زۆرتر لە وێنەکەدا



ا - پارچەی وەستاوی تەزووپێدەر Exc – Stator Coil - ئەم پارچەیە جێگیرکراوە لە لەشی جێگیری سەرەکی (Stator Main) هیچ جووڵەیەکی نییە، لە ئاسنێکی بازنەیی پەڕەداری موگناتیسی دروستبووە، چەند کەلێنێکی تێدایە، هەڵگری چەند پێچراوێکن بەدوای یەکدا دەبەسترێن، دواتر دەگەیەنرێت بە تەزوویەکی نەگۆڕ (DC) کە لە ڕێگەی کارتێك کە پێی دەوترێت (AVR) ڕێکخەری ڤۆڵتییەی ئۆتۆماتیکی، ئەمەش بەچەند پاڵهێزێکی کارەبایی جیاجیا کە پەیوەندیی بە خودی داینەمۆکەوە هەیە لە ٦ - ١٠٠ ڤۆڵت.



(پارچەی تەزووپێدەری وەستاو)

زانیاریی:

لە پارچەی وەستاوی تەزووپێدەردا (Exc-Stator Soil) بوارێکی موگناتیسی بەهێزی جێگیر دروست دەبێت بەهۆی تێپەڕبوونی تەزووی نەگۆڕ (DC) بەناو پێچە موگناتیسییەکاندا کە چەند جەمسەرێکن.

ب - پارچەی خولاوەی تەزووپێدەر Exc-Rotar Coil

ئەم پارچەیە لەسەر شێوەی بازنەیەکی لوولەکی پڕ دروستبووە لە چەند پەڕەیەکی ئاسنی موگناتیسی پێکهاتووە و کۆکراوەتەوە، لە ناویدا چەند ڕێڕەوێك هەیە، چەند پێچراوێك لە تەلی مس هەڵدەگرن، بەپێی هەنگاوی پێچران بەشێوەی ستار (Y) دەبەسترێت، بەجۆرێك کە سێ پێچراوەکە بە گۆشەی ١٢٠ پلە بێت، بۆ دروستبوونی سێ ڕەوگەی Three Phase

کارەبای تەزوو گۆڕاو (AC) کە لەسەر ئەستوونی ئەندامی سەرەکی خولاوە جێگیرکراوە.



(پارچەی تەزووپێدەری خولاوە)

ج - پردی دایۆدی (Diodes)

دوای ئەوەی پارچەی خولاوەی تەزووپێدەر (Exc) تەزوویەکی گۆڕاوی سێ رووگە (AC) سری فێس دروست دەکات، ئەم تەزووە گۆڕاوە بەناو پردێکی دایۆدیدا دەڕوات بۆگۆڕینی تەزووی گۆڕاو (AC) بۆ تەزووی نەگۆڕ (DC) دواتر بۆ سەر کۆیلی ئەندامی سەرەکی خولاوە.





## هێلکاریی تەواوی داینەمۆی تەزووگۆڕاو



## ناوی پارچەکانی جەنەرەیتەری دوو جێهەلگر (مۆدێل نوا) ( Name Of Parts Two Bearing Generator)

| ژمارە | ناوی پارچەکان | ژمارە | ناوی پارچەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | ئەندامی جێگیر | ٢٥ | گۆزکەرەوەی سەرەکی ئامرازی بەهێزکردنی تەزووی کارەبا (ئێکتی فایەر) رووی پشتەوە |
| ٢ | ئەندامی خولاوە | ٢٦ | پەیوەستکەر |
| ٣ | ئێکزایتەری خولاوە | ٢٧ | دایۆد- جەمسەری پێشەوە |
| ٤ | ئێکزایتەری جێگیر | ٢٨ | دایۆد- جەمسەری پشتەوە |

| ٥ | پاڵپشت و قەباغی N.D.E | ٢٩ | کونی بەرزکردنەوە - کاتی چاکسازیی |
|---|---|---|---|
| ٦ | سەرپۆش N.D.E | ٣٠ | کونی بەرزکردنەوە - کاتی چاکسازیی |
| ٧ | جا هەڵگری بازنەیی N.D.E (O) | ٣١ | پەیکەری پاڵپشتی کۆتایی (قەباغی کۆتایی) |
| ٨ | جا هەڵگری N.D.E | ٣٢ | پەنێڵی پەیوەستی سەرەکی (کێبڵی کارەبا) |
| ٩ | جا هەڵگری واشەری D.E | ٣٣ | کێبڵی پەیوەستکردنی کارەبا |
| ١٠ | پاڵپشت D.E | ٣٤ | دەسك و لێواری گرتن |
| ١١ | هێلەگی D.E | ٣٥ | پانکە |
| ١٢ | جا هەڵگری D.E | ٣٦ | کونی بنکە |
| ١٤ | پێگەی جەنەڕەیتەر | ٣٧ | بوورغو بەستن بنکە |
| ١٥ | سەرپۆشی پەیکەری بەشی خوارەوە | ٣٨ | سەرپۆشی ئامرازی A.V.R |
| ١٦ | سەرپۆشی پەیکەری بەشی سەرەوە | ٣٩ | پاڵپشتی دژە لەرزینی ئامرازی A.V.R |
| ١٧ | سەرپۆشی تێچووی هەوا | ٤٠ | کزکەرەوەی شوێنی پەیوەستکردن A.V.R |
| ١٨ | سەرە بۆکسی پەیوەستکردنی کارەبا | ٤٢ | ئێکزایتەری خولاوە (جەنەڕەیتەری موگناتیسی خولاوە P.M.G) |
| ١٩ | دوا پەنێڵی D.E | ٤٣ | ئێکزایتەری جێگیر (جەنەڕەیتەری موگناتیسی بەردەوام P.M.G) |
| ٢٠ | دوا پەنێڵی N.D.E | ٤٤ | بۆڵتی (جەنەڕەیتەری جێگیر P.M.G) |

| ٢١ | ڕێکخەری ڤۆڵتییەی ئۆتۆماتیکی A.V.R | ٤٥ | پیم و ئەستوونی (جەنەڕەیتەری موگناتیسی بەردەوام P.M.G) |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | تەنیشتە پەنێڵ | ٤٦ | گرەی (جەنەڕەیتەر موگناتیسی جێگیر P.M.G) |
| ٢٣ | پاڵپشت و ڕاگری A.V.R | ٤٧ | پەیوەستی - سیل (جەنەڕەیتەری موگناتیسی بەردەوام P.M.G) |
| ٢٤ | کۆکەرەوەی سەرەکی ئامرازی بەهێزکردنی تەزووی کارەبا (ڕێکتی فایەر) ڕووی پێشەوە | | |

ڕوونکردنەوە:

١- نەبوونی دوا جووڵە ١- N.D.E.

٢- دوا جووڵە ٢- D.E.

٣- داینەمۆی موگناتیسی بەردەوام ٣- P.MG.

٤- ڕێکخەری ڤۆڵتییەی خودکار (ئۆتۆماتیکی) ٤- A.V.R.





بابەتی دووەم:

ئامرازی تەزووپێدەر- ئێکزایتەر (المهیج- Exciter)
وەك داینەمۆیەکی بچووك وایە (لەناو پێکهاتەی جەنەڕەیتەرە گەورەکە)
لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت (دوو کۆیل).

یەکەم: کۆیلی جێگیر (عضو الثابت-Exciter Stator Coil)
دووەم: کۆیلی خولاوە (عضو الدوار- Exciter Rotor Coil)





یەکەم: کۆیلی جێگیر (عضو الثابت-Exciter Stator Coil)
تەبەڵەیەکی لە تەل هەڵپێچراوی گەورەیە لە چەند پێچێکی (کۆیل) مسی یەك لەدوای یەك پێکهاتووە ٨، ١٠، ١٢-٢٤ کۆیل هەردوو سەری سەرەتاو کۆتایی کۆیلەکان (کۆیلی جێگیر) بە ئامرازی A.V.R بەستراوە بۆ وەرگرتنی تەزووی کارەبا، هەڵدەستێت بە دروستکردنی تەزووی (D.C)، واتە بەهۆی ئامرازی A.V.R.

دووەم: کۆیلی خولاوە (عضو الدوار– Exciter Rotor Coil)
تەبەڵەیەکی پۆڵایە لە سێ هەڵپێچراوی (کۆیل) تەلی مس پێکهاتووە بە گۆشەی ١٢٠ پلە دانراون، کارەبای ٤٠٠ ڤۆڵ (A.C) Three Phase دروست دەکات کاتی خولانەوەی لەناو ستێتەر کۆیلی ئێکزایتەر و بەهۆی سێ ریز دایۆد تەزووەکە لە (A.C)ەوە دەگۆڕێت بۆ تەزووی (D.C) لە ڕێگەی دوو خاڵی (N.P) کە لەمەوپێش باسمانکرد دەبەسترێت بە ڕۆتەرِ کۆیلی سەرەکی گەورەوەی جەنەرەیتەر (Armature).
وەك لەم وێنەیەدا روونکراوەتەوە



(ئەندامی خولاوەی سەرەکی + تەزووپێدەری خولاوە + پانکە Fan)

**ئامراز و پارچە لاوەکییەکانی جەنەڕەیتەر**

١- بۆڵبەرین: هەموو جەنەڕەیتەرێك دوو شوێنی (بیرینگ) هەیە بۆ دانانی بۆڵ یان رۆڵ بیرینگ بەپێی رێنمایی پێویستیان بە گریزکردن (Grease) هەیە، شکانیان دەبێتە هۆی سووتانی رۆتەر کۆیلی سەرەکی (Armature).

٢- رێکخەری ڤۆڵتییەی ئۆتۆماتیکی A.V.R– Automatic Voltage Regulator

ئامرازێکی گرنگ و هەستیاری ئەلیکترۆنییە، هەڵدەستێت بە رێکخستنی پەستانی ڤۆڵتییە بۆ دەرەوە بە بڕی دیاریکراو نە زۆر نە کەم ٣٨٠- ٤٠٠ ڤۆڵت سری فێس و ٢٢٠ ڤۆڵ سنگڵ فێس بە هێرتز ٥٠H.Z لەوە، لەناو بۆردی کۆنترۆڵ Control Board دادەنرێت، چەند هێلکی کارەبای (Input) دەچێتە سەر ٤، ٦، ١٠ هێڵ بەگوێرەی کارتی A.V.R، هەیە ١١٠ ڤۆڵ ٢٢٠ ڤۆڵ ٣٨٠ ڤۆڵ، جگە لە دوو هێڵی تر (Output)، کە بەستراوە بە ستێتەر کۆیلی ئێکزایتەر (کۆیلی تەغذیە) بۆ پێدانی تەزووی کارەبا.



**- هۆیەکانی سووتانی ئامرازی ئەی، ڤی، ئاڕ**

١- خێرایی زۆری جەنەڕەیتەر کە لە جوولێنەرەوە (Engine) دروست دەبێت.

٢- بەرکەوتنی ئاو (شا) لە ڕێگەی شۆرین (بەکارهێنانی ئاو یان دروستبوونی شا).

٣- (شۆرت – Short) لەناو ئامرازی ئێکزایتەر بەهۆی بەرکەوتنی ڕۆتەر کۆیل بە ستێتەر کۆیل یان گەرمبوونی کۆیلەکانی دروست دەبێت.

٤- باری زۆر (Load) بەهۆی بەکارهێنانی کارەبای دەرەکی زۆر دروست دەبێت.

تێبینی:

یەکێك لە هۆیەکانی دەرنەکردنی تەزووی کارەبای جەنەڕێتەر سووتانی ئامێری (A.V.R)ە.

(هۆیەکانی سووتانی یان تێکچوونی ڕۆتەر کۆیلی سەرەکی Armature)

١– خێرایی کەم: واتا هێواش خولانەوەی جەنەڕەیتەر بەهۆی کەمیی گاز یان نەبوونی خێرایی لە جوولێنەردا بەهۆی کێشەی هونەریی.

٢- (شۆرت – Short) لە ئەنجامی لێکەوتنی گەرم و سارد یان گەرم و گەرم لە بازنەی دەرەوە و ناوەوەی سووڕی کارەبادا.

٣- بەرکەوتنی ئاو (شێ) لە ڕێگەی شۆرین یان بەهەڵە بەکارهێنانی ئاو یان شێی زۆر.

٥- شکانی بۆڵبەرینەکان: لە ئەنجامی گەرمبوون و ئیشکردنی زۆر هەروەها نەبوونی گریز.





(هۆیەکانی سووتانی دایۆد Diodes)

١- تێکچوونی هونەریی لە ڕۆتەر کۆیلی سەرەکی (ئارمێچەر) یان دروستبوونی شۆرت لە سەری.

٢- بەرکەوتنی ئاو (شێ) لە ڕێگەی بەهەڵە بەکارهێنانی ئاو.

٣- پێچەوانەبوونەوەی کارەبای سەرەکی بۆ ناو (جەنەڕەیتەر)، واتا بەهەڵە بەکارهێنانی کارەبای دەرەکی و گەڕانەوەی بۆسەر دایۆدەکان.

٤- شل بەستنی دایۆدەکان.

٤ - کۆنترۆڵ پەنێل (Control Panel)

بریتییە لە بۆکسێکی گەورە لە نزیك بەشی کارەبای جەنەڕەیتەر دادەنرێت بۆدانان و هەڵگرتنی چەند ئەوزارێکی کارەبایی، وەك ڕێکخەری ڤۆڵتییەی ئۆتۆماتیکی (A.V.R) و دووگمەکانی (ON) و (OFF) کارپێکردن و کوژانەوە و کارپێکردنی باری دەست و خۆبزوێن ( Auto – Manual) و دووگمەکانی کۆنترۆڵکردن (Rest – Test)، هەروەها گێچەکانی ئاماژەکردنی بڕی ڤۆڵتییە و هێرتز و ئەمپێری هەر سێ فێسەکانی خەرجکردنی تەزووی کارەبا لەگەڵ گێچەکانی (Gauges) بڕی گاز و پلەی گەرما و پاڵەپەستۆی ڕۆن و شەحنی پاتری و چەند گلۆپێکی سەوز و سوورو زەرد بۆ ئاماژەی کارپێکردن و کوژانەوە و باری زۆر (Over Load) جەنەڕەیتەر.





وەك لەم وێنەیەدا دیارن






**بنەمای زانستیی درووستبوونی تەزووی كارەبا**

كاركردنی داینەمۆی كارەبا لەسەر بنەمای زانستیی و یاسای زانا فارادایە كە دەڵێت: ئەگەر تەلێكی گەیەنەری داخراو لە بوارێكی موگناتیسیدا بجووڵێنین، لەناو تەلەكەدا پاڵهێزێكی (پ، هـ، ك) تێدا بەرهەم دێت، كە بە یەكەی ڤۆڵت (Volt) پێوانە دەكرێت، پاڵهێزی كارەبا $E = b + L$

E چڕی هێڵەكانی موگناتیسی

B خێرایی بڕینی هێڵەكان

L ڤۆڵت -Volt- یەكەی خوێندنەوەی پاڵهێزی كارەبایە، بڕی هێزەكەی پێ دەپێورێت، بڕی تەزووەكەش بە ئەمپێر Amper، بەرگریی تەلەكەش بە ئۆم Ome، بەم شێوەیە:

١- دۆزینەوەی بڕی ڤۆڵت.

ڤۆڵت = ئەمپێر × ئۆم

٢- دۆزینەوەی ئۆم.

$$\text{ئۆم} = \frac{\text{ڤۆڵت}}{\text{ئەمپێر}}$$

٣- دۆزینەوەی ئەمپێر.

$$\text{ئەمپێر} = \frac{\text{ڤۆڵت}}{\text{ئۆم}}$$

تێبینی: تا بەرگریی تەلێك (كۆیل) كەم بێت، تەزوو زۆر دەبێت، بە پێچەوانەوەش راستە، واتە هەر كۆیلێك بەرگریی (ئۆم) تەواو بوو تەزووی (ئەمپێری) تەواوی خۆی وەردەگرێت، بە واتایەكی دی بە درێژیی و باریكی تەل بەرگریی زۆر دەبێت، بە پێچەوانەوە بە كورتی و ئەستووریی تەل بەرگریی كەم دەبێتەوە و تەوژم و تەزووی كارەبای زۆر پێدا تێپەڕ دەبێت، توانا و هێزی داینەمۆش بە كیلۆ وات و كیلۆ ڤۆڵت و ئەمپێر دەپێورێت، توانای ڤۆڵت ئەمپێر ٨٠٪ واتە، بۆ نموونە ئەگەر ئامرازێك بەرهەمی ١٠٠ ڤۆڵت ئەمپێر بوو، دەكاتە ٨٠ وات، كەواتە یەك كیلۆ ڤۆڵت ئەمپێر = ٠٫٨ كیلۆ وات.





**شێوەی کارکردنی داینەمۆی تەزووگۆڕاو Alternateing Current Generatoer AC-**

لە بنەمای دروستکردنی داینەمۆی گەورەدا بەجۆرە تەزووی کارەبا بەرهەمدێت، کاتێك تەزووی D-C لەڕ ێگەی A-V-R دەڕوات بەناو کۆیلەکانی تەزووپێدەری جێگیرCoil Exc –Stator، بوارێکی موگناتیسی نەگۆڕی لەسەر دروستدەبێت. کاتێك داینەمۆ دەست دەکات بەخولانەوە، بەشی تەزووپێدەری جوولاو Exc-Rotar Coil لەگەڵیدا دەخولێتەوە لەناو بەشی تەزووپێدەری جێگیردا، لێرەدا بەپێی یاساو بیردۆزەی فارادای: کاتی بڕینی هێڵەکانی موگناتیسی کۆیلەکانی بەشی جێگیر بەهۆی کۆیلەکانی بەشی خولاوە ئەنجامەکەی دەبێتە دروستبوونی (پ، هـ، ك) لە کۆیلەکانی بەشی خولاوەدا، ئەم پاڵهێزە کارەبایە گۆڕاوەو بەرهەمبووەش لە ڕێگەی پردی دایۆدی لە تەزووی گۆڕاوەوە A-C دەبێتە تەزووی نەگۆڕ D-C دواتر دایۆدەکان (پ، هـ، ك) دروست بوو لە سێ ڕەوگەوە (سری فێس )دەکەنە یەك ڕەوگە، (سنگڵ فێس)و دەچێتە ناو کۆیلەکانی ئەندامی خولاوەی سەرەکی لە ڕێگەی خاڵی N-P (ئەندامی سەرەکی خولاوە) Armature دووبارە بۆ جارێکی تر بوارێکی موگناتیسی نەگۆڕ دروست دەبێتەوە لەسەر ئاسنی موگناتیسی ئەندامی خولاوەی سەرەکی Main Rotar Coil، ئەوەش دیسان بەهۆی سووڕان و بڕینی کایەی کۆیلەکانی نێوان جەمسەرەکانی ئەندامی جێگیری سەرەکی لەلایەن ئەندامی خولاوەی سەرەکی ئەم کردارەو جووڵانە کاریگەریی دەبێت لەسەر بواری موگناتیسی کۆیلەکانی ئەندامی سەرەکی جێگیر، لە کۆتاییدا بەپێی بیردۆزەکەی فارادای هێزو تەزووی کارەبایی سێ ڕەوگەمان Three Phase لە ئەندامی سەرەکی و کۆیلی جێگیر دەست دەکەوێت بە یەکسانی ١٢٠ پلە و بە پەستانی ٤٠٠ ڤۆڵت





لەنێوان هەریەك لە ڕەوگەکانی گەرم بە گەرم S-T-R بە ستنی شێوە دەلتا A و پەستانی ساردیش لەگەڵ هێڵی چوارەم کە لە ناوەوە سەری هەرسێ جەمسەری کۆیلەکانی پێکەوە بەستراوە، دەبێتە سارد (N)، لەگەڵ هەریەك لە گەرمەکان، واتە ٢٢٠ ڤۆڵت بەم بەستنەش دەڵێن بەستنی شێوە ستار Y.



بابەتی سێیەم:

## تێکچوون و گرفتە هونەرییەکانی داینەمۆی تەزووگۆڕاو – A-C Generator

١- لەکارکەوتنی کارتی ئەی ڤی ئاڕ - سووتان، پچڕان و قاڵبوونەوەی نەخشەی ئەلیکترۆن.

٢- سووتان یان تەقینی دایۆدەکان.

٣- سووتانی کۆیلی سەرەکی جێگیر ~ ٣.

٤- شکانی بۆڵبەرینەکان.

٥- سووتانی ئامرازی تەزووپێدەر Exciter.

٦- سووتانی کۆیلی سەرەکی خولاوە Main Rotar Coil لە ئەنجامی پێدانی پەستانی کارەبای زۆر لە ئەی، ڤی، ئاڕ-ەوە یان دابەزینی هێرتز (Hz) لە ئەنجامی کەمبوونەوەی خێرایی جوولێنەر (تێکچوونی بەشی میکانیک).





**بیەدۆزەی دروستبوونی جەنەڕەیتەری مۆدێل نوا**

(جەنەڕەیتەری جۆری ستامفۆرد - Stamford – A.C Generator)

بەپێی بنەما و پێکهاتەی سەرەکی ئێکزایتەر سێ جۆرن:

١- جەنەڕەیتەری کۆنترۆڵداری A.V.R- تەزووپێدەری جووڵاو (ئێکزایتەر) (Self Excited A.V.R Controlled Generator–)



٢- جەنەرەیتەری کۆنترۆڵداری A.V.R تەزووپێدەری جووڵاو- ئیکزایتەر، موگناتیسی جێگیر

Permanent Magnet Generator (P.M.G)
Excited A.V.R Controlled Generator



٣- جەنەرەیتەری کۆنترۆڵداری ترانسفۆرمەر
(Controlled Generator Transformer)







## بابەتی چوارەم:

### چێنج ئۆڤەر سویچ - Change Over Switch

### چێنج ئۆڤەر سویچ چییە؟

**سویچی گۆڕینی هێڵەکانی کارەبا و جۆرەکانی:**

ئامرازێکی کارەباییە لەناو بۆکسێکی گەورەدا Box Panel دادەنرێت بۆ گۆڕینی دوو هێزی کارەبا (دوو هێڵی سەرەکی) یان زۆرتر بەکاردەهێنرێت، کە جیاوازن لە یەکتری، بەتایبەت لەسەر تۆڕی کارەبای سێ هێڵ (Three Phase) چوونە ناوەوەی دوو هێزەکەش ( Power In Put) هەندێجار لە یەک کاتدا دەبێت بێ ئەوەی تێکەڵاوی یەکتر ببن، دەرچوونی هێزەکەش (Out Put Power) تەنها یەک هێزە لەو دوو هێزە کە لە رێگەی دەرچووی سەرەکی چێنج ئۆڤەر سوویچەکەوە دەبێت بۆسەر ئەو ئامێرانەی کە پێویستە کارەبایان پێ بگەیەنی بۆ کارپێکردن، بەکورتی: واتە بەکارهێنانی هێزی سەرەکی داینەمۆ لە لایەک و هێزی کارەبای سەرەکی لە لایەکی تر بەپێی بوون و پێویست بێنەوەی بەر یەک بکەون.





میکانزمی درووستبوونی چێنج ئۆڤەر بەم جۆرانەی خوارەوەیە:

**یەکەم: جۆری دەستی Manual Change Over Switch**

لە کەم شەفتێك (Cam Shaft) پێکدێت بەهۆی دەسکەوە بە سووڕان ئیشی خۆی دەکات (Manual Control)، لە ڕێگەی چەند پلاتین و سپرینگێك لە سێ لاوە خاڵی بەیەکگەیشتن و پچڕاندن ڕوودەدات، کە هیچ لایەك لە دوو لای تێچوونی هێزەکان بەر یەك ناکەون، تەنها ئەو لایەی کە مەبەستە (داینەمۆ یان کارەبای سەرەکی) بە یەك دەگات لەگەڵ لای دەرچوونی سەرەکی بۆسەر ئامێرە کارەباییەکان بۆ گەیاندنی هێزی کارەبا، دانانی لەناو بۆکسێك دەبێت بۆ ئیشکردن و بەستنەوەی هێڵەکانی کارەبای سەرەکی داینەمۆ.



(چێنج ئۆڤەر سویچ – جۆری دەستی)





دووەم: جۆری خودکار Automatic Change Over Switch.

لە دوو کۆنداکتەر Main Conductor سەرەکی پێکدێت، لەگەڵیدا دوو کۆنداکتەری یارمەتیدەر Auxiliary Conductor و تایمەرێکی کارەبایی Timer و چەند ئامرازێکی تری کارەبای هاوکار پێکدێت، بۆ کارپێکردنی هەردوو کۆنتاکتەرە سەرەکییەکە، بە شێوەیەکی رێکوپێك و گونجاو بۆ گەیاندنی هێزی کارەبای مەبەست، داینەمۆ یان سەرەکی، بۆسەر دوا دەرچەی سەرەکی چێنج ئۆڤەرەکە (Power Oout Put)، هەروەها چەند دووگمەیەکی کارپێکردنی (On و Off)و دووگمەی گۆڕینی لای هێڵی سەرەکی و لای هێڵی داینەمۆی لەسەر رووی پێشەوەی پەنێڵەکە هەیە لەگەڵ دوو گڵۆپی سەوز و سوور بۆ زانینی داگیرسان و کوژانەوەی.

ئەم جۆرە بەهۆی کارەبای ناوخۆی بە شێوەی خودکار ئیش دەکات، کە بەهۆی دەستەوە دووگمەی گۆڕینی هێڵی سەرەکی و داینەمۆ هەڵدەبژێرین، ئەمەش بۆ پێدانی تەزووی کارەبا بە کۆنداکتەرە سەرەکییەکان، بەم شێوەیە:

- بۆ گەیاندنی کارەبای سەرەکی بۆ ئامێرە کارەباییەکان لە رێگەی چێنجەکەوە، دەبێت کۆنداکتەری کارەبای سەرەکی On بکرێت.

واتا کۆنداکتەری هێڵی داینەمۆ Off دەبێت.

- بۆ گەیاندنی کارەبای سەرەکی بۆ ئامێرە کارەباییەکان لە رێگەی چێنجەکەوە، دەبێت کۆنداکتەری کارەبای داینەمۆ On بکرێت.

واتا کۆنداکتەری هێڵی سەرەکی Off دەبێت.





کاری ئاڵوگۆڕی ئەم دووهێزەی کارەبا لە ڕێگە چەند لمیت سویچێکی ناوەکی کۆنداکتەرە سەرەکییەکان و دوو کۆنداکتەرە یارمەتیدەرەکان دەبێت، تا لەیەك کاتدا تەنها ڕێگە بە یەك لای هێڵی کارەبا بدرێت بۆ دەرچوونی و کارپێکردنی ئامێرە کارەباییەکان کە لەناو کارگەکان و پرۆژەکانی ئاو دادەنرێن.



(چێنج ئۆڤەر سویچ - جۆری خودکار)





## سێیەم: جۆری فوڵ ئۆتۆماتیک Full Automatic Change Over Switch

ئەم جۆرە لە دوو کۆنداکتەری گەورەی سەرەکی دروستکراوە، بەڵام زۆر پێشکەوتووتر، بەهۆی دوو بزوێنەری کارەبایی Motor Rise کاردەکەن، بۆ بەرزکردنەوەی چەکوش و ماشەکانی کۆنداکتەرەکان، کە لە رێگەی کارەبای تێچوونی خۆی دەستبەجێ و راستەوخۆ لەگەڵ کارەبا هاتنە سەری بێ بەکارهێنانی دەست، فەرمان بە کارکردنی کۆنداکتەرەکان دەکات بەپێی هەبوونی هەر یەکێك لە هێزەکانی کارەبا، چ داینەمۆ چ کارەبای سەرەکی، یەك لا واتا یەك کۆنداکتەری سەرەکی کاردەکات، ئەوە لە کاتێکدا کە هەردوو هێزەکە هەبن (یەکەمجار هێزی کارەبای سەرەکی بێت باشترە)، بەڵام لەکاتی بوونی یەك هێزدا هەر ئەو هێزە دەردەکات.

لەگەڵیدا دوو کۆنداکتەری بچووك هەیە بۆ فەرماندان بەکۆنداکەرە سەرەکییەکان و بۆ کوژاندنەوە و ئیشکردنیان، لەسەر کۆنداکتەرە سەرەکییەکان دووگمەی رێکخەری ئەمپێری هەیە Adjustment، ئامرازی فیس فولەر Phase Failureی هەیە بۆ کاتی هەڵگەڕانەوەی هێڵەکانی کارەبا (ئامرازی پاراستن)، کە ناهێڵێت کار بە چێنج ئۆڤەر بکات.



(چێنج ئۆڤەر سویچ - جۆری فوول ئۆتۆماتیك)

**بابەتی پێنجەم:**

**ژینگە و جەنەرەیتەری جۆری جوولێنەری گاز ( Environment and Generator Diesel Engine).**

**یەکێك لە سەرچاوەکانی پیسبوونی ژینگە، جوولێنەرەکانی داینەمۆی سووتەمەنییە کە راستەوخۆ دەبێتە هۆی ژەهراوییبوونی هەوای سەر زەوی و کەمبوونەوەی رێژەی غازی ئۆکسجین و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای هەوا، ئێستا لە کوردستان نزیکەی یەك ملیۆن داینەمۆی جۆری بەنزینی مالآن هەیە، ئەوە جگە لە داینەمۆی فەرمانگە حکومییەکان و کۆمپانیاکان و داینەمۆی جوولێنەرەکانی گاز (Set Generator) لە وێستگە سەرەکییەکانی شارو شارۆچکەکان، کەواتە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی ئەم هۆکارە، ئەرکی سەرەکی ئێمەیە هەر لەو شوێنەوە کە بۆ کاتژمێرێك کاری تێدا دەکەین، ئەمەش بۆ تەندروست راگرتنی ئاو و خاك و هەوایە (خاوێنراگرتن باشترە لە پاکردنەوە).**

**بەرێزان، پیسبوونی ژینگە کارێکی ئاسانە، ئەگەر گوێی پێنەدرا و رێگەی هۆکارەکانی نەگیرێت، بۆیە دەبێت ئێمەی مرۆڤ زۆر بە زانستییانە بیر لەو مەسەلەیە بکەینەوە و هەمووومان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین بەرامبەر ئەو کارە پیرۆزە، کە پاکراگرتنی دەوروبەرمانە، چونکە پیسبوونی هەوا لە رێگەی کارکردنی ئامێرەکانی سووتەمەنییەوە زۆر ترسناکە، گومانی تێدا نییە جوولێنەرەکانی بەنزین و گاز و خەلۆوزو گەرمی... هتد، بەتایبەت جوولێنەری گازی داینەمۆی وێستگەکانی کارەبای شار و شارۆچکەکان، پرۆژە و کارگەکان، گەرەکەکان... رۆڵێکی زۆر دەبینن لە**





کەمکردنەوەی ڕێژەی ئۆکسجین و یەکێکە لە پیسترین پاشماوەی گازی ژەهراویی، جگە لە کاربۆن و دووکەڵ و ڕەشیی کە ڕۆژانە لەناو گەڕەك و سەر شەقامەکانی ناوشار بە هەزارەها پێ سێجا لەو گازە ژەهراوییە خنکێنەرە دەکەنە هەوا و دواتر سییەکانمانەوە، هەرکاتێك جوولێنەرێکی گازیی داینەمۆ ٨ - ١٦ پستۆن کار دەکات، کۆمەڵێك گاز و دووکەڵی لێ دروست دەبێت، کە ڕاستەوخۆ کاریگەریی بۆسەر ژینگە هەیە و زیانی گشتیی لێدەکەوێتەوە دژ بە تەندروستی هەموو زیندەوەرێك، هەتا وشکبوونەوەی گەڵای درەختەکان، سەرەڕای ژاوەژاو و دەنگی ناخۆش، کە سامناکترین گازی یەکە ئۆکسیدی کاربۆن (CO) و دووانە ئۆکسیدی کاربۆن ($CO_2$)و هایدرۆکاربۆن (HC)و قوورقوشمە، بۆ نموونە گازی یەکە ئۆکسیدی کابۆن کە لە ئەنجامی سووتانی گاز و بەنزین بەرهەم دێت، گازێکی ژەهراوییە، لە هەموویان پیسترە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ، لەبەرئەوەی لەگەڵ هیمۆگلۆبینی خوێن یەك دەگرێت و بەربەست دەبێت لە گەیاندنی ئۆکسجین بۆ خانەکانی لەش.

خۆشەویستان: هەموومان ئەوە دەزانین تاچەند ئامێرەکانی خۆشگوزەرانی ژیانی مرۆڤ پێشبکەوێت، کەچی لایەنی خراپەکاریی و زیانی گشتیی هەرلێدەکەوێتەوە، ئەمەش ئەگەر بێت و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و دوور لە پەیڕەو و ڕێنمایی زانستییانەو بێ هەستی مرۆڤایەتی بەکاربهێنرێن، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵانەی زانایان بۆ پاکڕاگرتنی ژینگەو سەلامەتیی مرۆڤ ڕەچاوی دەکەن، تاکاریگەرییە خراپەکان نەگوازرێنەوە بۆ سەر تەندروستیمان، بۆیە ئێستا هەوڵدراوە ڕێگە بگیرێت لە بڵاوبوونەوەی ئەو





گازە ژەهراوییە خنکێنەرانە، کە لە ئەنجامی سووتان و کارکردنی داینەمۆ گازەکان بەرهەمدێن، ئەوەش بە دروستکردنی وزەی کارەبا لە هێزی ئاو و با، تیشکی خۆر، شەپۆلی دەریا لەگەڵ دروستکردنی پاڵێونەر (فیلتەر) بۆ گلدانەوەو پالاّوتنی پاشماوەی سووتان (گەردیلەی گازەکان، دووکەڵ، کاربۆن) وەك چۆن کەمولّەی کەمکردنەوەی دەنگ وژاوەژاو دانراوە (صالنصا) لەسەر جوولّێنەرەکانی سووتەمەنی (Diesel Engine).





## بەشی سێیەم

**بابەتی یەکەم:**

**کارپێکردن و ئاگالێبوون (Operation and Maintenance)**

پشکنینی رۆژانەی داینەمۆکان:- (٢٠K.V.A)-(٤٠k٠v٠A)-(١٠٠ K.V.A)-(٤١٠ K.V.A)-(٢٥٠ K.V.A)-(٦٠ K.V.A).

**<u>پێش کارپێکردن:</u>**

١- پشکنینی ئاستی رۆن- Oil level.

٢- پشکنینی ئاستی ئاو- Water Level.

٣- پشکنینی ئاستی گاز- Fuel level.

٤- پشکنینی فیلتەری رۆن- Oil filter.

٥- پشکنینی فیلتەری گاز- Fuel filter.

٦- پشکنینی قایشپانکە (سێر) – V-belt.

٧- دڵنیابوون لە کونی تەنفیسی تانکی گاز، نەگیرانی.





٨-	پشکنینی لیڤلی ئاو و ترشەڵۆکی ناو پاتری $H_2SO_4$ تێکردنەوەی ئاوی پاڵێوراو ئەگەر کەم بوو.

٩-	پشکنینی فیلتەری هەوا – Air Filter.

١٠-	کونی بچووکی سەرە چارەکانی پاتری دەبێت کراوە بن (کونی تەنفیس).

١١-	دڵنیابوون لە شلنەبوونەوەی قوڵاغەکانی داینەمۆ.

١٢-	دڵنیابوون لە هەر شتێکی نامۆ لەناو داینەمۆکە، بەتایبەت لە بەشی (تغذیة) کارەباکەی و شوێنی پانکە و قایشپانکە وەك پارچە کانزا- پشیلە- مار- باڵندە... هتد.



**(تێبینی):**

**پێویستە لەسەر کارپێکەر (مشغل) گرنگی بەم ڕێنماییانەی سەرەوە بدات بۆ کارپێکردنی داینەمۆ.**

**دوای کارپێکردن:**

**دوای کارپێکردنی داینەمۆ (Dynamo) پێویستە کارپێکەر (مشغل Operator) تێبینی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات بۆ چاوەدێریکردن و ئاگاداریی داینەمۆ کە لەسەر پەنێلی (Board Dish) کارپێکردن بەشی لای کارەباکە دانراوە بۆ زاڵبوون بەسەر هەر تێکچوونێکی کارەبایی و میکانیکی کتوپڕ کە ڕوو دەدات.**

**١- تێبینی لەسەر دەنگ و لەرزە بۆدڵنیابوون لە کارکردنی ڕێکوپێك.**

**٢- تێبینی لەسەر بەرزونزمیی میلی گێچی ڕۆن، بەتایبەت بەرزبوونەوەی، دەبێت بگاتە شوێن و پلەی دیاریکراوی خۆی لە دوای ١٥ چرکە کە نیشانەیە بە پاڵەپەستۆی ترومپای ڕۆن (Oil Pump)، کە بەتەواویی ئیشی خۆی دەکات.**

**٣- تێبینی لەسەر کاری گێچی پلەی گەرمی (حمارة)، دەبێت لە ٨٠ (هەشتا پلەی سەدی) تێپەڕ نەکات، چونکە لە ١٠٠ پلەی سەدی ئاو دەکوڵێت.**

**٤- تێبینی لەسەر بۆرییەکانی ئەکزۆز (کپکەری دەنگ) (Silencer)، نابێت هیچ لیکێکی هەبێت و ئامێری تۆربۆ چارج نابێت ڕۆنی پێدا بێتە خوارەوە.**





٥- تێبینی، ڤۆلتییە، دەبێت میلی گێچی ڤۆڵمیتەر بگاتە شوێنی دیاریکردنی خۆی، کە بڕی گەرم بەگەرم (Phase Three) ٣٨٠-٤٠٠ ڤلّ و بڕی گەرم و سارد (Phase Sing) ٢٢٠-٢٤٠ ڤل بخوێنێتەوە، کە بەهۆی سویچی تایبەت بە خۆی لەسەر پەنێلّ هەیە بۆ تێستکردنی فێسەکان. (کەخوێندنەوەی گێچی ڤۆلتمیتەر، واتە تێکچوون هەیە لە بەشی کارەبا (تغدیة) ناو پەنێلّ).

٦- تێبینی لەرەلەر (Hz) دەبێت میلی گێچی هرتز بگاتە ٥٠ پلە، کەمتر لەوە زیان بە داینەمۆکە دەگەیەنێت، واتە فیلتەری گازو سووڕی گاز تەواو نییە.

٧- تێبینی لەسەر گێچی ئەمپێرییە، دەبێت دوای گەرمبوونی داینەمۆ باری لێبدەین (Load)، هەروەها رەچاوی بڕی ئەو ئەمپێرییە بکەین کە ئامێری ئیشپێکراو (بزوێنەرەکان- Motors) رایدەکێشین و نابێت زۆرتر بێت لە سنووری دیاریکراوی خۆی. بەکارچوونی بڕی ئەمپێرییەی زۆرتر لە هێزی داینەمۆ، دەبێتە هۆی دەنگ دەرکردن و لەرزین و گەرمبوونی بزوێنەر (Engine) بەهۆی گوشاری بەشی (تغدیة) لەسەر بەشی میکانیکی دواییش جامبوونی بزوێنەر یان شکانی پستۆن و قۆڵەبەگن.





**زانیاریی:**

١- دەبێت زۆر ئاگاداریی ڕێژەی بارکردنی داینەمۆ بکەین (Load)، واتە دەبێت ئەوە بزانرێت کە ئەو ئامێرانەی کاریان پێدەکرێت کەمترن لە هێزی (Power) داینەمۆکە.

٢ – لەکاتی ئیشکردنی داینەمۆ، نابێت سەری رادێتەر (Cover) بکرێتەوە.

٣- بەپێ خواسی داینەمۆ، نابێت ئیشی پێ بکرێت، یان دەستکاریی بکەین.

٤- لەکاتی ئیشکردنی داینەمۆ، نابێت هیچ شتێکی نامۆ بخرێتە بەردەم و سەر رادێتەر و ئەگزۆز.

٥- لەکاتی ئیشکردنی داینەمۆ، نابێت ئاو بە رادێتەر و یان بەشی میکانیکی (جوولێنەر)دا بکرێت.

٦- لەکاتی ئیشکردنی داینەمۆ، نابێت منداڵ و کەسی نامۆ نزیکی بکەوێت.

٧- بە هیچ شێوەیەك نابێت بەشی کارەبای (داینەمۆ) کاتی وەستان و ئیشکردنی بشۆردرێت یان ئاوی پێدا بکرێت.





(روونکردنەوە)

داینەمۆ دەبێت ماوەیەك کاربکات تا گەرم دەبێت (بۆ ماوەی ١٥ خولەك) دوایی باری لێ بدرێت بەم شێوەیە:-

١- قاتع (C.B) داینەمۆ (On) بکە.

٢- ئامرازی (Change Over Switch) (On) بکە. ئەگەر جۆری فوول ئۆتۆماتیکی نەبوو.

واتە گۆڕینی لاینی سەرەکی کارەبا بۆ سەر لاینی داینەمۆ ( Main Power To Dynamo).

٣-دوایی یەك بەیەك قاتع (C.B) مۆتۆرەکان (On) بکەو کاریان پێ بکە لە ڕێگەی ستارتەرەکانیان.

تێبینی:

دەبێت بڕی بارکردنی داینەمۆ بەگوێرەی ئەو بڕە ئەمپێرە (Load)بێت کە هونەری پرۆژەکە دیاریکردووە و لەسەر کارپێکەری داینەمۆ (مشغل) پێویستە ڕەچاوی خشتەی کارکردنی چۆنییەتی و چەندایەتی مۆتۆرەکان بکات کاتی کوژانەوەی کارەبای سەرەکی، لەسەر ڕێنماییەکانی لێپرسراوی هونەریی یان لێپرسراوی پرۆژەکە بڕوات و نابێت کارپێکەر داینەمۆ بەجێبهێڵێت، دەبێت بەردەوام چاودێریی ئیشکردنی بکات. کاتی ڕوودانی هەر ناتەواوییەك ئاگاداری بەرپرسی هونەریی بکات و دوای وەستانی بەهۆی تێکچوون، لە خۆیەوە دەست نەکات بەکاری دەستتێوەردانی داینەمۆ تا کەسی شارەزا و تەکنیکی ئاگادار نەکات.





**بابەتی دووەم:**

**ئەرکەکانی کارپێکەر (مشغل Operator)، کە پێویستە لە سەری بەرامبەر داینەمۆ:**

**١-	دڵنیابوون لە دووگمەی کوژانەوەی ناچاریی ( Emergency Switch)، کە کوژاوە نییە (واتە پاڵ نەنراوە) بەتایبەت لە سەرەتای کارپێکردن.**

**٢-	تێستکردنی یەکەم فیلتەری گاز بۆ دەرکردنی ئاو ئەگەر گازەکە پیسبوو و پێویستی کرد.**

**٣-	تێستکردنی جارجارێك لاینی (کێبڵ) سەرەکی نێوان داینەمۆر قاتع (C.B) لە پچڕان و برینداربوون و شتی تر.**

**٤-	کاتی کارپێکردنی داینەمۆ دەبێت قاتعی سەرەکی (Main Circuit Breaker) کوژاوە بێت.**

**٥-	سەیرکردن و پاککردنەوەی ڕۆژانەی پاتری (Battery) بەتایبەت چاوی پاترییەکان.**

**٦-	پاکوخاوێن ڕاگرتنی سەری پاترییەکان و داپۆشینی سەری ساردو گەرم بە گریز تا ئۆکسید نەکەن و بەستنیان بەتوندیی تاوەکو سلف (وەگەڕخەر-The Starter) بە ڕێکوپێکی کاری خۆی بکات.**

**٧-	دڵنیابوون لە گەیشتنی هەوای پاك بۆ ناو داینەمۆ، دەبێت هەوا گۆڕکێ لە رادێتەر بەشێوەیەکی ئاسایی و بەردەوام هەبێت.**





٨- خاوێنكردنەوەی رادێتەر دەبێت كونەكانی نێوان بۆری ئاوی نێوان تانكی بەشی سەرەوە و تانكی بەشی خوارەوە لەگەڵ پولەكەكەیان زۆر پاك و كراوە بن.

٩- دڵنیابوون لە كاركردنی بۆری تەنفیسی ئاو لەسەر رادێتەرەكە.

١٠- لابردنی هەرشتێكی نامۆ دوای پاككردنەوەو چاكسازیی لەسەر داینەمۆكە وەك (پەڕۆ-سپانە-دەرنەفیس- چەكوش... هتد).

١١- تاقیكردنەوەیەكی سەرەتایی گشتیی بەشی میكانیك و كارەبای داینەمۆ بۆ دڵنیابوون لە نەبوونی لیكی گاز، لیكی رۆن، لیكی ئاو، یان شلبوونەوەو شكانێكی بچووك و ساكار... هتد.

١٢- پاككردنەوەی رۆژانەی گشتیی پارچەو ئامێرەكانی دەرەوەی داینەمۆ لە پیسیی وەك: (تۆز و خۆڵ یان گازو رۆن)، هەروەها خاوێنكردنەوەی دەوروبەری داینەمۆ لە رۆن و گریز بۆ روونەدانی هەڵخلیسكاندنی كارمەندان لەگەڵ پەیڕەوكردنی سەلامەتیی پیشەیی (سلامة صناعي).





## (کوژانەوەی داینەمۆ)



بۆ کوژانەوەی داینەمۆ پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

١- یەکەم جار مۆتۆری ترومپاکان بکوژێنەوە بەهۆی ستارتەرەکانیان (دووگمەی سوور -Off).

٢- دوای نەمانی بار (Load)، قاتع (C.B) داینەمۆ (Off) بکە.

٣- یەکسەر داینەمۆکە مەکوژێنەوە بۆ ماوەی ١٥ خولەك با ئیش بکات تا خۆی سارد دەکاتەوە.

٤- دوایی بیکوژێنەرەوە.

٥- دەرگاکانی کابینەی داینەمۆ دابخەرەوە جێی مەهێڵە بەکراوەیی ئەگەر داینەمۆکە (Outdoor) بوو، لەبەر هەندێك کاری سەلامەتیی دەوروبەر.

## رێنمایی گشتیی بۆ سەلامەتیی داینەمۆکە:

تکایە ئاگاداری ئەم رێنماییانەی خوارەوە بکە بۆ ئەوەی هیچ بەرپرسیارییەك نەکەوێتە ئەستۆت:

١- هەموو رۆژێك رێنکۆڕینێك فیلتەری هەوا پاکبکرێتەوە لەگەڵ خاوێنکردنەوەی دەوروبەری رادێتەری ئاوی داینەمۆکە.

٢- لەکاتی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی زۆری کتوپڕ یان پەیدابوونی هەر دەنگێکی نائاسایی لە داینەمۆ و هەر کارێکی نائاسایی تر، دەستبەجێ داینەمۆ رابگرە و ئاگاداری لایەنی بەرپرس بکەرەوە (تەکنیکی شارەزا).

٣- لە کاتی بەرکەوتنی ئاو بە بەشی کارەباکەی (تولید) بەهەر هۆیەك بێت، کاتی شۆرین- بارانبارین- هەر بارێکی تر دەستبەجێ داینەمۆ بکوژێنەوە.

٤- ئاگاداری کەمبوونەوەی ئاستی گازی ناو تانکی بکە تا ئەو خڵتەو پیسییەی بنی تانکییەکە نەڕوات بۆ ناو پەمپ و بۆری و نۆزڵەکان. یان ئەو بڕە گازەی کە تێیدایە نەگاتە نزیکی کۆتایی، تا کاری هەوا دروستبوون روو نەدات.

٥- کاتی ئیشکردنی داینەمۆ (لۆد لەسەر بوون) ئەگەر دەنگی نائاسایی هەبوو، دەستبەجێ داینەمۆکە رابگرە.

٦- کاتی کارکردنی داینەمۆ دەست نزیکی پانکەو قایشپانکە مەکەرەوە.





٧- لە کاتی سەردانی هەر کەسێکی نامۆ خۆت ئاگاداری سەردانەکەبەو بە هیچ شێوەیەك مەهێڵە بێ ئاگاو پرسی تۆ دەستکاریی بکات و مەهێڵە منداڵ نزیکی داینەمۆکە بکەوێتەوە.

٨- کاتی خزمەتکردنی داینەمۆ لەلایەن گریزمان یان فیتەر، دەبێت کارپێکەر ئاگاداری رەوشی ئەو کارە بێت کە لەسەر داینەمۆ ئەنجامدەدرێت، وەك: (رۆنگۆڕین- وایەرمەنی- چاکسازیی میکانیکی و کارەبایی و هەر دەستکارییەکی تر جگە لە خاوەن و پسپۆڕی هونەریی کە خۆی بەرپرسیاری یاسایی داینەمۆکەیە.

٩- بەردەوام ئاگاداری بارو کارکارکردن (Loading) داینەمۆ بە، چونکە زۆربەی تێکچوونەکان لەکاتی کارکردن و بارکردن (Load) لە داینەمۆکە دروست دەبن.

١٠- بەوردیی و بەردەوامی فۆڕمی کارپێکردنی داینەمۆ پڕبکەرەوە، وەك کاتەکانی رۆنگۆڕینی (Oil) بەکارچوونی گاز (Fuel)، هەروەها زۆر پێویستە بارەکانی ڤۆلتییە، ئەمپێرییە و هێرتز بزانرێت بە فۆڕمی تایبەت بە کارکردنی رۆژانی پێشوو، چونکە زۆر گرنگ و پێویستە بۆ کاتی سەردانی کەسی شارەزا و تەکنیکی پەیوەندیدار بۆ هەڵسەنگاندنی باری پێشتری داینەمۆ و زانینی هەندێك وردەکاریی هونەریی کاتی ئیشکردن لەسەری.





**بابەتی سێیەم:**

**رۆنگۆڕین**

زۆر گرنگە ئاگاداری ئەو ماوەیە بکرێت کە رێکخراوی (UNDP) جیهانیی دایناوە بۆ گۆڕینی رۆنی بزوێنەری داینەمۆکان (بۆ هەموو داینەمۆکان گەورەو بچووك) کە ٤٠ کاتژمێرە، بەڵام پێویستتر و ئەگەر بکرێت رۆنی ستاندارد بەکاربهێنرێت، کە ئەو کات دەتوانرێت ماوەی رۆنگۆڕین زۆر بکەین، ئەگەر نا رۆنی عێراقی بەکاربهێنرێت زۆر باشترە لە جۆری رۆنەکانی تر.

(چۆنییەتی رۆنگۆڕین لە داینەمۆکاندا)

١- داینەمۆ کارپێ بکە تا گەرم دەبێت.

٢- دوای گەرمبوون بیکوژێنەوە.

٣- کەپی (Cap) خوارەوە بکەرەوە لەگەڵ ئۆرینگ (O-ring) هەموو رۆنەکە دەربکە لە بزوێنەر (Gngine) ئەگەر ئۆرینگ تێکچووبوو بیگۆڕە.

٤- ئەگەر بکرێت هەندێك رۆنی پاك بکەرە ناو بزوێنەر بۆ پاکبوونەوەی ناو هەناوی لە پاشماوەی هەر پیسییەك.





٥- چاوەڕێ بکە تا ١٠ خولەکێك تا بەتەواویی دوا دڵۆپەی ڕۆنی پیسی پاشماوە دادەچۆڕێت (جارجارە بە ڕۆنی هایدرۆلیك ناو بزوێنەر بشۆریت باشە).
٦- ئێستا ڕۆنی پاك تێبکە تا ئاستی دیاریکراو، دەبێت لە لیڤڵی کەم (Min) کەمتر نەبێت و لە لیڤڵی زۆر (Max) زۆرتر نەبێت. (بەهۆی شیشی تێستکردنی ڕۆن (Oil Dipstick) ئاستی ڕۆنی ناو بزوێنەر تێست بکە).
٧- ڕۆنی باشی عێراقی پلە ٤٠ بۆ وەرزی هاوین و پلە ٣٠ بۆ وەرزی زستان بەکاربهێنە.
٨- کاتی گۆڕینی فیلتەری ڕۆن، ڕۆنی نوێ بکەرە فیلتەرەکەوە.
٩- کاتی گۆڕینی فیلتەری ڕۆن، بەڕێکوپێکی فلتەرەکە شوێنی خۆی بگرێت و تێبینی دانانەوەی لاستیکی واشەرئۆ-رینگ ژێری بکەو بزانە باش چووەتەوە شوێنی خۆی.







**بابەتی چوارەم:**

**پاراستن و ئاگالێبوونی ئامێری داینەمۆ ( Dynamopreventive and Maintenance)**

**لەسەر بەشی کارەبا + بەشی میکانیك**

**رۆژانە: بەکارهێنانی چاو و دەست و گوێ**

**١ - چاو بۆ سەیرکردنی گێچەکانی ڤۆڵتییە- ئەمپێری- هێرتز- گوشاری رۆن- پلەی گەرمی- رێژەی سووتەمەنی- گڵۆپەکانی کۆنترۆڵ و ئاگادارکردنەوە.**

**٢- بەچاو پشکنینی لێچوونی رۆن و گاز و ئاو بۆ ئەو شوێنانەی ئەگەری لیکیان هەیە (Leakage).**

**٣ - بەچاو پشکنینی ناو داینەمۆ، وەك سەر پانکە و پێش رادێتەر بکرێت بۆ دڵنیابوون لە شتی نامۆ.**

**٤ - بەچاو پشکنین بۆ تاقم وایەری ناو داینەمۆ و کێبڵە سەرەکییەکانی دەرچووی کارەبا بکرێت، بۆ دڵنیابوون لە پریشکە (Spark) بەر یەککەوتن (Short).**

**٥ - بەچاو تێبینی رەنگی دووکەڵی (پاشماوەی سووتان) سەر ئەگجۆز بکرێت، رەش و شین و سپی، سپی OK.**

**٦ - بەدەست تێستی کێبڵە سەرەکییەکانی دەرچووی کارەبا بکرێت ( Out put Cable) بۆ دڵنیابوون لە گەرمیی و شلبوونەوەیان.**





٧ - بەدەست تێستی لەرزین و جوولەی جوولێنەر بکرێت، بەتایبەت داینەمۆی بچووك و مامناوەند.

٨ - بەگوێ ڕێژەی (Noise) دەنگە دەنگی جوولێنەر تێبینی بکرێت، بزانرێت لە ئاستی ئاساییدایە یان نا، وەك: دەنگی شکانی رینگ، قۆڵەبەگن، پستۆن و زمانەکان و هەروەها کەمیی ڕۆن.

٩ - بەگوێ تێبینی لەسەر دەنگی ئاسایی و نائاسایی (شکانی) بۆڵبرینگەکان بکرێت، بەشی کارەبایی – داینەمۆ.

هەفتانە:

١- بەچاو تێستی ئاستی ڕۆن بکرێت بۆ دڵنیابوون لە کەمکردنی.

٢- بەچاو تێستی ئاوی ناو رادیێتەر بکرێت بۆ دڵنیابوون لە کەمبوونەوەی.

٣- بەچاو پشکنین بۆ وایەرەکانی ناو داینەمۆ (تائم وایەر) بکرێت، بۆ دڵنیابوون لە پچڕان، برینداریی، شلبوونەوە.

٤- بەچاو پشکنین بۆ کەم و زۆریی ئاستی سووتەمەنی (گاز) بکرێت، بە سەیری گێچی سووتەمەنی (Fuel Gauge) یان لیڤڵی جۆری ستوونی تانکی گاز.

٥- بەچاو پشکنین بۆ ئاستی تێزاب و ئاوی ناو باتری (Battery) بکرێت، لەسەری لیڤڵی کەم و زۆری دیاریکراوە، بەتایبەت لە وەرزی هاویندا، دڵنیابوون لە نەگیرانی کونەکانی سەر باترییەکە (کونی هەواگۆڕکێ- التهوية-Ventilation Hole).





مانگانە:

١- تێبینی لەسەر دەنگی (Noise) جوولێنەری داینەمۆ بکرێت، تا بزانرێت دەنگی ئاسایی خۆی نەگۆڕاوە.

٢- پشکنین لەسەر رادێتەر بکرێت، تا بزانرێت نەگیراوە بە شتی نامۆ، وەك: چەوریی، قوڕو پیسی، پووش و پەڵاش و پەڕۆ.

٣- پشکنین بۆ سەمونەو بوورغوە سەرەکییەکانی (قولاّغ) بەستنەوەی جوولێنەرو داینەمۆ بە پەیکەرەوە (Chassis) بکرێت، بۆ دڵنیابوون لە شل و توونددییان.

٤- خاوێنکردنەوەی پاڵێونەری هەوا (Air Filter) لە شتی نامۆ بە هەوالێدانی بەهۆی فوکەری هەوا (Blower Air).

٥- پشکنین بۆ کەم و زۆریی گریز لە جێگۆکان (Bearings Ball) بکرێت بەپێی پێویست بە گریزکردنیان بە گریزی باش جۆری ( Shell Alvania R٣) بەرگر لە پلەگەرمی بەرز، بەگوێرەی کاتژمێری کارکردن و کەتەلۆك، بەتایبەت لە هاویندا.

٦- پشکنین بۆ لیفڵی شلەی ناو باتری بکرێت، بزانرێت ئاو و تێزابی ($H_2SO_4$)ی کەم نەکردووە.

٧- پشکنین بۆ هەردوو سەری گەرم و ساردی باتری بکرێت، کاری پاککردنەوەیان بۆ بکرێت و بەئاوی گەرم بشۆدرێن و گریز بکرێن.

٨- پاککردنەوەی بەشی کارەبای داینەمۆ بەهۆی ئامرازی فوکەر دواتر بە پەڕۆی وشك و خاوێن (کاتی وەستانی داینەمۆ)، هەروەها پاککردنەوەی بەشی میکانیکی داینەمۆ (جوولێنەر) بەهۆی پەڕۆی نەوتاویی یان گاز بەشێوەیەکی لەسەرخۆ دواتر سڕینەوەی.





سالآنە:

١- شۆرینی جوولێنەر (Engine) بەهۆی نەوت یان گاز دواتر پاککردنەوەی بە بەنزین و سڕینەوەی بە پەڕۆی وشك و خاوێن.

٢- پاککردنەوەو شیشکردنی ناو رادیتەری ئاو لای وەستای شارەزا لەگەڵ خاوێنکردنەوەی بەشی دەرەوەی پوولەکەکانی (الصعانف- Fins) رادیتەرەکە.

٣- پشکنین بۆ تاقم وایەری بەشی بەرهەمهێنانی کارەبا (تغذیة) بکرێت، بۆ دڵنیابوون لە سپارك و ستۆکبوونی وایەرو کێبڵەکانی پەیوەستکردن (Connection Box)و تێستی بڕی بەرگریی گشت تێرمینەڵ و وایەرەکانی بەشی کۆیلی جێگیر بکرێت Insulation Resistance For Stator Coil.

٤- پشکنین بۆ روڵ و بۆڵبێرنگەکان بکرێت و بزانرێت بەپێی کاتژمێری کارکردن و هێز و ماوەی بەرگریی هەڵسووڕانیان ماوە یان تا پێش ئەوەی بشکێن و ببنە هۆی دروستبوونی کێشەی هونەریی گەورە، وەك سووتانی ئەندامی خولاوە Armatur بەهۆی لێکەوتنی لەگەڵ ئەندامی جێگیر Stator.

٥- پشکنین بۆ بەشی بەرهەمهێنانی تەزوو (تغذیة) داینەمۆ بکرێت، بۆ پاککردنەوەی بازنەی خلیسکێنەر و هەڵگری فەحمەکان و کۆمیتەیتەر Commutator – Brush Support and Sslip Ring، ئەگەر داینەمۆکە لەو جۆرو بابەتە بوو بەشێوەیەکی هێواش و زانستییانە.





تێبینییەکان:

١- گۆڕینی پاڵێوەنەری ڕۆن، سووتەمەنی، هەوا، بەگوێرەی فۆرمی کارکردن بە کاتژمێر بەپێی سیستمی جیهانیی ڕێکخراوی (UNDP).

٢- پاککردنەوەی شوێنی بۆڵ و ڕۆڵەکان Bearing لەگەڵ گۆڕینی یان نوێکردنەوەی گریز کاتی شکانیان، بۆ نموونە بۆڵبرینی ژمارەو جۆری ٧٣٢٢B ١٠٠ گم گریزی دەوێت، لە جۆری Shell AlvaniaR٣ بۆ ٢٨٠٠ کاتژمێر، بۆڵبرینی ژمارە و جۆری ٣٠ NU ١٠٣٠ B گم گریزی دەوێت لە جۆری Shell Alvania R٣ بۆ ٣٠٠٠ کاتژمێر.

٣- بەهۆی گۆڕینی دەنگی داینەمۆ (بەشی میکانیک) هەست دەکرێت کە داینەمۆ تەزووی کارەبا دەردەکات یان نا، چونکە بە کارەبا دروستکردن جووڵێنەر بەقورسی هەڵدەسووڕێت، ئەمەش دەبێتە هۆی تێرو کپی دەنگی جووڵێنەرەکە، بەپێچەوانەوە داینەمۆ سووک هەڵدەسووڕێت و دەنگی تیژ دەبێت.



**ڕێنمایی دانان و بەکارهێنانی داینەمۆ**

١- دانانی داینەمۆ پێویستە لە شوێنێکی بەربەرەڵا بێت، تا بەشێوەیەکی سروشتی و ئاسایی هەواگۆڕکێ ڕووبدات لەکاتی کارکردنی و پلەی گەرمی بەرز نەبێتەوە.

٢- دروستکردنی بنکەیەکی کۆنکرێتی شیشداری پتەو (Basement) بەپێی سایز و پێوانەی داینەمۆکە، ئەگەر بکرێت تامانێکی ئاسنی هەبێت.

٣- پێویستە هەموو مانگێك داینەمۆ کرداری خاوێنکردنەوەی بۆ بکرێت، بۆ ڕزگاربوون لە خۆڵ و چەوریی و گازی زیادە کە لەسەر لەشی کۆدەبنەوە.

٤- پێویستە تێبینی ئاستی ڕۆنی جووڵێنەر و ئاستی ئاوی ڕادێتەر بکرێت هەموو ٤٨ کاتژمێر جارێك.

٥- پێویستە کاتی تێکردنەوەی گاز لە داینەمۆدا تێبینی جۆری چڕیی و تووخمی نامۆ بکرێت، وەك تێکەڵبوونی ئاو کە کێشەی هونەریی لێدەکەوێتەوە.

٦- پێویستە پاڵێوەنەری ڕۆن هەموو (٢٥٠) کاتژمێر جارێك بگۆڕدرێت.

٧- پێویستە پاڵێوەنەری گاز هەموو (٥٠٠) کاتژمێر جارێك بگۆڕدرێت.





٨- پێویستە پالێوەنەری هەوا هەموو (١٠٠٠) کاتژمێر جارێك بگۆڕدرێت.

٩- پێویستە ئەو ڕۆنەی بەکاردەهێنرێت ستاندارد (Standard)یان لەگەڵ خەسڵەتی ڕێکخراوی (UNDP) جیهانی بێتەوە.

١٠- پێویستە گۆڕینی ڕۆن بەپێی کاتژمێری دیاریکراو بێت، دواکەوتنی کێشەی هونەریی دەبێت.

١١- هەموو داینەمۆیەك کە سەرەتا دادەنرێت یەکەم ماوەی ڕۆنگۆڕینی ٢٥ تا ٣٠ کاتژمێر زۆرتر نەبێت.

١٢-پاڵێوەنەری ئاو جارجار دەبێت پاکبکرێتەوە: ئەگەر هەبوو لە داینەمۆدا.



## بابەتی پێنجەم:

## تێکچوونە سەرەکییەکانی جەنەرەیتەر- میکانیکی و کارەبایی

## Trouble Shouting–Mechanical and Electrical

| ژ | تێکچوون | هۆکار | چارەسەر |
|---|---|---|---|
| | وەگەڕخەر (سلف) خۆی تەواوە، بەڵام کار بەجووڵێنەر (engine) ناکات. | ١- لاوازیی یان مردنی پاتری<br>٢- خراپی لە پەیوەستەکانی پاتری.<br>٣- فیوز (fuse) پەنێڵی سەرەکی سووتاوە یان دووگمەی سویچی سەرەکی لەسەر لای (Off) دانراوە.<br>٤- تێکچوونی ناوەی جووڵێنەر، وەك نزمبوونەوەی پاڵەپەستۆی رۆن و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جووڵێنەر کەریلەی کۆنترۆڵ | ١- شەحنکردنی یان گۆڕینی پاتری.<br>٢- باش بەستنی پەیوەستەکان.<br>٣- فیوز بگۆڕە، دووگمەی سویچی سەرەکی بخەرەوە لای (on).<br>٤- دووگمەی (Break down) لەسەر کۆنترۆڵی پەنێڵ بجووڵێنە.<br>٥- کلیلی کۆنترۆڵی پەنێڵ بخەرەوە سەر (on) یان (Auto).<br>٦- دووگمەی سویچی (فریاکەوتنی خێرا) بسووڕێنە بەلای ڕاست و |





| | | | |
|---|---|---|---|
| | | بەربەستێ بۆ کارپێکردن.<br>٥- کلیلی کۆنترۆڵی پەنێڵ لەسەر (Off) دانراوە.<br>٦- دووگمەی سویچی(فریاکەوتنی خێرا) پاڵدراوە بۆناوە. | رایکێشە دەرەوە. |
| ٢ | وەگەڕخەر(سلف) کاردەکات بەڵام جووڵێنەر( Machine) ناکەوێتە کار ئەم تێکچوونە زۆر روودەدات. | ١- کۆیلی رێگە پێدانی گاز(stop solenoid) لەسەر ترومپای سەرەکی گاز ئیش ناکات.<br>٢- بڕی رۆنی ناو جووڵێنەر کەمە.<br>٣- گاز لە تانکی سەرەکیدا نەماوە.<br>٤- سیستمی گاز هەوای کردووە.<br>٥- پاڵێوونەری هەوا (شووتە) گیراوە. | ١- تێستی وایەرو کۆیلەکە بکە.<br>٢- رۆن بگۆڕە.<br>٣- تانکی گاز پڕ بکە.<br>٤- هەوا لە رێگەی پاڵێوونەرەکانی (filter)گازەوە دەر بکە.<br>٥- پاڵێوونەری هەوا (شووتە) پاك بکەرەوە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣ | جەنەرەیتەر کارەبا نادات تەنها (Half) تەزوویەکی بێ هێز نەبێت (بێ لۆد). | ١- سوتان یان پچڕانی بازنەی کارەبای رۆتەر کۆیل یان ستێتەر کۆیلی سەرەکی.<br>٢- سوتانی فیوز کۆیلی سەر (AVR) (رێکخەری ڤۆڵتییەی ئۆتۆماتیکی).<br>٣- تێکچوونی دایۆدەکان لە خولگەی رێکخستنی کارەبا (بەهۆی گەڕانەوەی کارەبای دەرەکی).<br>٤- خێرایی جوولێنەر (engine)ی جەنەرەیتەر هێواشە.<br>٥- ئامرازی (AVR) تێکچووە (بەهۆی شۆرت، ئاو، خێرایی زۆر). | ١- تێستکردنی هەموو بازنە و پەیوستە کارەباییەکان بەتایبەت جزینی لەدوای یەك.<br>٢- گۆڕینی فیوز.<br>٣- تێستکردنی دایۆدەکان بە ئەڤۆمیتەر یان پاتری و گلۆپ ٤,٥ ڤۆڵ یەك لەدوای یەك.<br>٤- زۆرکردنی خێرای جوولنەر بە پێدانی سووتەمەنی گاز.<br>٥- گۆڕینی (AVR) یان چاککردنەوەی. |
| ٤ | جەنەرەیتەر کارەبا دەرناکات. | ١- پچڕان و ونبوونی ڤۆڵتییە لە هێڵەکانی سەرەکی دەرچوونی کارەبا. | ١- تێستی ڤیسەکانی (هێڵ) سەر کۆنێکشنی سەرەکی و چاککردنی.<br>٢- بەستنەوەو چاککردنی |





| ژ | | | |
|---|---|---|---|
| | | ٢- پچڕان و سووتانی بازنەی تەزوو دروستکەری جووڵاو (Exciter)و ڕێکخستنی ڤۆڵتییە.<br>٣- سووتانی فیوزو ئامرازی (AVR). | بازنەی تەزوو دروستکەری جووڵاو (ئێکزایتەر).<br>٣- گۆڕینی فیوز و چاککردنەوەی (AVR). |
| ٥ | دابەزینی ڤۆڵتییە کاتێك جەنەڕەیتەر لۆدی دەچێتە سەر. | ١- تێکچوونی دایۆدەکان لە خولگەی ڕێکخستنی تەزووی کارەبادا.<br>٢- کەمبوونەوەی خێرایی جووڵێنەر (Machine) کاتی بارکردن (Load) لەسەر جەنەڕەیتەر.<br>٣- زۆریی لە بەکارهێنانی ئامێرە کارەباییەکان (بارکردنی زۆر). | ١- تێستکردنی دایۆدەکان و چاککردنیان.<br>٢- تێکچوونی ئیشی ترومپای سووتەمەنی (Pump Fuel) یان بۆرییەکانی پەیوەست کونبوون، لیچوون هەیە، هەواکردن، پیسیی تانکی سووتەمەنی (گاز).<br>٣- گۆڕینی کارتی (AVR). |
| ٦ | بەرزبوونەوەی ڤۆڵتییەی | ١- یەکێك لە سێ فیسەکانی دەرچووی | ١- تێستکردنی هەر سێ فیسەکانی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | جەنەڕەیتەر. | (Put Out) کارەبای سەرەکی ناو جەنەڕەیتەر سووتاوە، پچڕاوە.<br>٢- کارتی (AVR) تێکچووە. | جەنەڕەیتەر (UVW) لەسەر کۆنێکشن لەگەڵ چاککردنەوەی فێسە پچڕاوەکە.<br>٢- گۆڕینی کارتی (AVR) بەنوا. |
| ٧ | هەڵگەڕانەوەی ڤۆڵتییە. | ١- ڕێکخەری جێگیری ڤۆڵتییەی ناو جەنەڕەیتەر کاری ڕێکخستنی خۆی ناکات Stability) (Adjustmen (خراپبوون، شلبوونەوە). | ١- توندکردنەوەی یەکەم دوورگمەی ڕێکخەری جێگیری ڤۆڵتییە. |
| ٨ | کارەبای نێوان فێسەکان تەرازوو نین. | ١- جیاوازیی لە بار (Load)و بەکارهێنانی کەم و زۆریی تەزووی کارەبا لەنێوان فێسەکان (بەتایبەت لە سیستمی سەنگڵ فێس-دا ٢٢٠ڤۆڵ) | ١- دابەشکردنی کارەبای هەرسێ فێسەکان بەسەر ئامێری کارەباییەکان بەگوێرەی ژمارەیان بۆ تەرازووکردنی بڕی ئەمپێری (Load) لەسەر هەر فێسێك بەهۆی بەکارهێنانی کلامپ میتەر Ampere) (Meter. |
| ٩ | کارەبای | ١- شۆرت هەیە لە | ١- تێستکردنی کێبڵ و |





| | | | |
|---|---|---|---|
| | جەنەڕەیتەر دەپچرا (Breaker) خۆ ڕاناگرێت، ڕیلەی موگناتیسی سەرەکی گەرم دەبێت. | پەیوەست و دامەزراوە ئامێرە کارەباییەکانی دەرەوەدا.<br>٢- بار زۆرە ( Too Load Much). | پەیوەستە دامەزراوەکانی ئامێرەکان (چاکسازیکردنی).<br>٢- دیاریکردنی بڕی ئەمپێری گونجاو لەسەر بۆکس پەنێلی بڕێکەری سەرەکی جەنەڕەیتەر بەپێی هێز و توانای (KVA). |
| ١٠ | جەنەڕەیتەر لەپڕ دەکوژێتەوە.<br><br>ئەم تێکچوونە زۆر ڕوودەدات. | ١- پاڵەپەستۆی ڕۆن کەمە<br>٢- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جوولێنەر.<br>٣- گاز لە تانکی سەرەکیدا نەماوە.<br>٤- تێکچوونی کۆنترۆڵ پەنێلی (Starter Panel).<br>٥- فیوزی کۆنترۆڵی ناو ستاتەر پەنێل سووتاون.<br>٦- جوولێنەر | ١- تێستکردنی لیڤڵی ڕۆن، کەمبوو زۆری بکە.<br>٢- تێستکردنی چوون و دەرچوونی هەوای ناو کابینەی جنەڕەیتەر.<br>٣- تانکی پڕ بکەرەوە لە گاز.<br>٤- ڕێستکردنی (Reset) سویچی کۆنترۆڵ پەنێل بە جوولانی لەباری ( Off) بۆ سەر (Auto).<br>٥- ڕێستکردنی دووگمەی فیوز لەباری (Off) بۆ (On) یان گۆڕینی بە یەکێکی تر. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | لەڕێکخستنی کارکردنی خۆی دەرچووە.<br><br>٧- ئامرازی زۆرکردنی خێرایی تێکچووە (Speed Engine Control).<br>٨- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ڕۆن.<br><br>٩- سویچی کۆنترۆڵ پەنێڵی سەرەکی (Off) بووە<br><br>١٠- دووگمەی کوژاندنەوەی فریاکەوتنی خێرا (Emergency Stop Button) Off بووە. | ٦- پەیوەندیی بکە بە وەستای شارەزا (Fitter).<br>٧- ڕێستکردن و تێستکردنی . دووگمەی ئامرازی زۆرکردنی خێرایی.<br>٨- تێستکردنی لێڤڵ و ڕەنگ و جۆری ڕۆن، پەیوەندیی بکە بە وەرشەی ڕۆنگۆڕ.<br><br>٩- سویچی کۆنترۆڵ پەنێڵ بخەرەوە سەر (On) یان (Auto).<br>١٠- دووگمەی کوژاندنەوەی فریاکەوتن (On) بکە بە بادانی بەلای ڕاست و ڕاکێشانی. لەگەڵ بردنی دووگمەی سەرەکی کارکردنی لەباری Off \ Reset بۆ باری Auto. |





## بەشی چوارەم:

## بابەتی یەکەم

(زاراوەکان – المصطلحات – Vocabulary)

| کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی |
|---|---|---|
| داینەمۆ، بەرھەمهێنەری کارەبا، ئامێری گۆڕینی هێزی میکانیکی بۆ هێزی کارەبا. | مولد کهربي، الة تحويل الجهد الميكانيكي الي قوة الكهربائية | Dynamo' erator |
| خۆبزوێن، | الحركة الطوعية | Automatic |
| کارەبا | الكهرباء | Electricity |
| جێگیر | مستقر | Static |
| جوولاو | متحرك | Dynamic |
| میکانیکی- ئامێری | ميكانيكي، الي | Mechanic ~ Mechanical |





| Electro – Magnetic | مولد كهرباء بالمغنطيسي، الكهرباء بالمغنطيسية. | كەهرۆ موگناتیسی، موگنەکار . |
|---|---|---|
| Magnetic field | مجال المغناطيسي | کایەی موگناتیسی |
| Rotor Coil | عضو الدوار | ئەندامی خولاوە |
| Stator Coil | عضو الثابت | ئەندامی جێگیر |
| Armature | طبلة المولدة، نواة | ئارمێچەر- ناوکی بەرهەمهێنەری کارەبا. |
| A.C Alternate Current | تيار المتناوب، تيار المتبادل | تەزووی گۆڕاو |
| D.C Direct Current | تيار المستقر، تيار المستمر | تەزووی نەگۆڕ |
| Frequency Meter | مقياس الذبذبة الظولتية | پێوەری لەرەلەری هێزی کارەبا |
| Engine – Machine | محرك، محول | جوولێنەر |
| Unit | وحدة | یەکە |
| Coil | ملـــــف | هەڵپێچ، پێچراو |
| Cell Electric | طاقة او خلية الشمسية | کارۆ رووناکی |
| Turbine | طاحونة، دوام، الدردور، محرك الدوار | ئاش، خولێنەر جوولێنەری خولانەوە. |
| Station | محـــطة | وێستگە |





| Dam | ســــــد ، خزان | بەنداو |
| --- | --- | --- |
| Cataract | شـــــلال، مسقط المياة | تاڤگە |
| Mobile | متحرك | جوولاو، شتێك تواناى جوولانى هەبێت |
| Machine Works Shop | ورشة، مصنع اعمال العامة المعمل | وەرشە ، شوێنى چاكسازيى |
| Diesel Engine | محرك الديزل | جوولێنەرى گاز |
| Motor | قوة المحركة، محرك الميكانيكي | بزوێنەر |
| Chemical --------- | تفاعلات الكيمياوية | كارلێكردنى كيميايى |
| Dirt Environment | بيئة الملوثة | ژينگەى پيس |
| Steam Force | قوة البخار | هێزى هەڵم |
| Boiler<br>Steam Engine | مرجل، غلاية | كولێنەر |
| Fuel Injection Pump | مزاخة حقن الوقود | ترومپاى هۆقنەى سەرەكى گاز |
| Air Filter | مرشح الهوا | پاڵێونەرى هەوا |
| Oil Filter | مرشح الد هن | پاڵێونەرى رۆن |
| Fuel Filter | مرشح الوقود | پاڵێونەرى سووتەمەنى |





| Wind Power | قوة الريح | هێزی با |
|---|---|---|
| Wind Power Turbine | طاحونة قوة الريح، دوام الهوا، محرك دواريعمل بالريح | ئاشی با، خولێنەری هێزی با. |
| Kine Tic Energy | ذاتية الطاقة | وزەی خۆیی |
| Benzine Engine | محرك البنزين | جوولێنەری بەنزین |
| Heat and Chemical Energy | قوة الحرارة و الكيمياوية للوقود | هێزی کیمیایی و گەرمی سووتەمەنی |
| Large Equipment | مكائن السقيلة | ئامێرەگەورەکان |
| Electrical Motor | محرك الكهربائي | بزوێنەری کارەبا |
| Turbine Machine | محرك التوربيني | جوولێنەری تۆرباین |
| Steam Powr Turbine | توربين البخاري | توربایینی هەڵمی |
| Hydor Powr Turbine | توربين المائي | تۆربایینی ئاویی |
| Wind Powr Turbine | توربين الهوائي | توربایینی هەوای (ئاشی با). |
| Single Phase | مرحلة الواحدة - احادية القطب | یەك هێڵ |
| Three Phase | ثلاثة القطب | سێ هێڵ |
| V – Belt | حزام | قایشپانکە |





| Load | حمل | بار |
|---|---|---|
| Charge Air Cooler | مبردة الهوا | ساردكەرەوەی هەوا |
| Oil Cooler | مبردة الزيت | ساركەرەوەی رۆن |
| Gas | غاز، بخار، مزود بالبنزين | غاز، گاز، هەڵم تێکەڵی بەنزین |
| Gas Nozzel | خرطوشة الوقود - | پرژێنەری گاز |
| Gas Stop Solenoid | ملف توقوف الوقود (طاز) | کۆیلی وەستانی گاز |
| Turbo Charge | دوامة الهواء، محرك لدوران الهوا | جوولێنەری هەوای بەردەوام |
| Glow Plug | شمعة التوهج | پلاکی گەشانەوە |
| Speed Control | مسيطر السرعة | رکێفی خێرایی |
| Pressure nut | صمولة الضغط | جۆزەی پاڵەپەستۆ |
| Governor | التحكم | دادوەری هێز و خێرایی |
| Mark | علامة | نیشانە |
| Pump | مضخة | ترومپا |
| Valve | صمام | زمانە |
| Breathing Valve | صمام التهوية | زمانەی هەوا گۆڕکێ |





| | | |
|---|---|---|
| Slide Valve | صمام التزحلق | زمانەی خلیسکێنەر |
| Cylinder | اسطوانة | لوولەك |
| Cylinderes Block | كتلة الاسطوانات | بلۆكی لوولەكان |
| Shaft | عمود | ئەستون |
| Coupling | المفصل- قاطرة - وصال | پەیوەستکەر |
| Cam shaft | عمود التاكيهات - محورالحد بات | ئەستوونی كامەكان – كەمشەفت |
| In let Hole | ثقب الدخول | کونی چوون |
| Out let Hole | ثقب الخروج | کونی دەرچوون |
| Booster Regulator | منظم الدفع | ڕێکخەری پاڵنەر |
| O – Reng | حلقة علي شكل(O) | ئۆ- رینگ، واشەر، بازنەی شێوە (o). |
| Cover | غطاء | سەرپۆش (كەڤەر) |
| Viscosity | لزوجة | لینجی |
| Lubrication | تشحيم | چەورکردن |
| Relay | ارحال - المناول | ریلە - لێکوەرگر |
| Alternate Current Generator | مولدة ذات التيار المتغير | داینەمۆی تەزوو گۆڕاو |





| Main Tanance | صيانة – ادامة | چاككردنەوە – ئاگاليبوون |
|---|---|---|
| Exciter | مهيج - محرك المساعد | جوولێنەری تەزووپێدەر ياريدەر |
| Control Panel Dish Board | لوحة المسيطرات - لوحة التشغيل | بۆردی كارپێكردن |
| Bearing | محمل - مسند | جا - شوێن- هەلگر- راگر |
| Ball bearing | محمل الكرة | جێ گۆ- گۆ هەلگرەكان |
| Ball | كرة المدورة | گۆ – خڕ |
| Roll | كرة المسطتيلة | گردێن، لوولەكی |
| The Star Ter | محرك الذاتي - محرك بدْ الحركة | وەگەڕخەر - سلف |
| Diode | صمام ثنائي القطب للالكترونات | دايۆد: زمانەی يەك رای ئەليكترۆنی |
| Voltage Stability Adjustment | منظم ثبات الفولتية | رێكخەری جێگيری ڤۆلتييە |
| Short (Short – Circuit Electricity | دائرة الكهربائية القصيرة | كارەبای كورت (بازنەی كارەبای كورت) |
| Automatic Voltage Regulator | منظم اوتوماتيكي للفولتية | رێكخەری ڤۆلتييەی خودكار(ئەی ڤی ئار). |
| Diesel Engine | محرك الديزل | جوولێنەری ديزڵ |





| | | |
|---|---|---|
| Diesel Fuel Oil | زيت وقود الديزل | رۆنی سووتەمەنی دیزڵ |
| Sketch | رسم التخطيطي، مسودة | هێڵکاری |
| Out Put | خروج | دەرچوو |
| In put | دخول | تا چوو |
| Gaûges | مقايس، معيار | پێوەرەکان |
| Fuse | مصهر | فیوز (توانەرەوە) |
| Emergency Switch | مفتاح الاضطراري | سویچی فریاکەوتنی خێرا |
| Stop Solenoid | ملف التوقف | هەڵپێچراوی وەستان |
| Half | نصف | (هاڤ) نیوە |
| Engine - Machine | محرك | جوولێنەر - ماشێن |
| Fuel Pump | مضخة الوقود | ترومپای سووتەمەنی |
| Amper Meter | مقياس التيار الكهربائي | پێوەری تەزوو |
| Voltmeter | مقياس جهد القوة الكهربائية | پێوەری ڤۆڵتییە |
| Reset | ا ستراحة | پشوودان |
| Teset | فحص | پشکنین |





| Engine Speed Control | مسيطر سرعة المحرك | رکێفی خێرای جووڵێنەر |
|---|---|---|
| Change Over Switch Manual | مفتاح متبادل القوة اليدوي | سویچی ئالوگۆڕی دەستی |
| Auxiliary Conductor | موصل المساعد | کۆنداکتەری یارمەتیدەر |
| Current Adjustment | منظم التيار | ڕێکخەر ئەمپێری |
| Over Load | زيادة في الحمل | باری زۆر |
| Phase Failure | انقطاع الخط، جهاز كاشف العيوب الكهربائية | فێس فولەر، ئامرازی دەرخستنی تێکچوونی هێڵی کارەبا |
| Environment | البيئة | ژینگە |
| Environment Impact Assessment | مؤثرات الجوية او الطبيعية ظواهر البيئية | دیاریکردنی سروشتییەکان، دیاریکردنی ژینگە |
| Spark | شرارة – البرق | پریشکە، تریشقەی کارەبا |
| Spark Arrester | مانعة الشرر | بەرگریی تریشقە |
| Noise | الضوضاء | دەنگەدەنگ |
| Air Blower | نفاخ، منفاخ | فوکەر |





| Fins | ظعانف | پوولەکە |
|---|---|---|
| Non Drive End | عدم حركة النهائية | نەبوونی دوا جووڵە N.D.E |
| Drive End | الحركة النهائية | دوا جووڵە D.E |
| Permanent Magnet Generator | مولدة ذات للمغناطيس المستقرة | داینەمۆی موگناتیسی بەردەوام P.M.G |
| Automatic Voltage Regulator | منظم ظولتية الطرعية (الاوتوماتيكية) | ڕێکخەری ڤۆڵتییەی خودکار A.V.R |
| Boundary Wall | سياج | تامان - شوورە |
| Frequency Meter (Hz) | مقياس ذبذبة التيار | پێوەری لەرەی تەزوو |





## سەرچاوەکان


١ - زانیاریی گشتیی.

٢ - زانیاریی کارەبای داینەمۆکان- کەتەلۆگی

Volvo Penta Generating Set and Industrial Engines ١٩٩٨ AB

STAMFORD – AC GENERATORS -٣

From Newage Inter National

Installation , Service and Maintenance Manual -- ٢٠٠١

٤- گۆڤاری کارەبا، ژمارە ١، ١٨، ٢٠ (بۆ وێنەکان).






**سوپاس و پیزانین**

سوپاس و پیزانینم بۆ هاوکارانی خوارەوە کە لە چاپگەیاندنی ئەم پەرتووکە ((داینەمۆ)) (Generator Set)و لە نووسین و زانیاریی زانستی ئەم بوارە یارمەتیدەرو هاندەرم بوون، هەروەها ئەرکیان کێشا لە پێداچوونەوەی هونەری بابەتەکان و زمانەوانیی بەتایبەتی برای هێژا (م- عوسمان) خۆزگە دەخوازم نمونەیان زۆر بێت بۆ پێشخستنی رەوش و کاروانی زانست و هونەریی.

١ – سەباح عەبدوللا - بەڕێوەبەری کتێبخانەی رانیە.

٢- ئیبراهیم محێدین موراد - ل. سەندیکای تەکنیککاران.

٣ - نیازی محەمەد عەزیز - نووسەر و شاعیر.

ئامادەکار

بیتوێن سەعید محەمەد

رانیە- سەرماوەرزی ٢٧٠٩





## نووسەر لە چەند دێڕێکدا:



- بیتوێن سەعید محەمەد - نووسەر و وەرگێڕ

لەدایکبووی شاری رانیە ساڵی ١٩٥٩ز، دەرچووی پەیمانگای نەوت، ساڵی ١٩٨٠ز،

خاوەنی بڕوانامەی دبلۆم هونەریی- بەشی پەمپەکان.

- هۆنەر لە بواری هۆنراوە بۆ منداڵان.

- ئەندامی کۆمەڵەی ژینگە و کوردستانێکی سەوز.

- ئێستا، لێپرسراوی بەشی هونەریی- فەرمانگەی ئاوی رانیە

بەرهەمەکانی:

- (مێژووی ئۆتۆمبێل و پێکهاتەکانی) ساڵی ٢٠٠٢.

- (سۆزی دڵ) هۆنراوە بۆ منداڵان ساڵی ٢٠٠٧.

-(خونچە گوڵ) هۆنراوە بۆ منداڵان ساڵی ٢٠٠٨.





## پێڕست







